# گەشتی پێنج رۆژەی سەرۆك لەكوردستاندا





سەروكی فەرماندە صداء حسین (خواپیپ ریزیت)هەمیشە دەیەوێ لە نزیكەوە لەگەڵ رۆلەكانی كوردمان گفت وگو بكات و لەگەلیاندا دابنیشێت وداخوازی یەكانیان جیبەجی بكات.

ئەوە بو لەم دوایی یەدا پێنج روژ لەسەریەك چوە شوێنە دوورونزیكەكانی كوردستان، هەموومان لەتەلەفزیون ئەوپیاوە پیرەمان بینی كەشان بەشانی سەروك دانیشتبوو بوی ئەگێرایەوە كەچوٚن (هوپ)لە ئوتومبیلەكان ئەكات و(ماكوهوپ)ی دەست ئەكەوێ. سەروكی دلسوز ئەمری دا، دوكانێكی خنجیلانەیان لە هەمان شوێن بو دروستكرد.

سەروك چوە دەربەندیخان لەگەڵ هاونیشتمانی یەكان وت و وێژی كرد و فەرمانیدا زەوی یان بەسەردابەش بكرێت بو ئەوەی خانووبەرەی نوێ دروست بكەن.

سەروكی فەرماندە نزیك بەكەلار ئاوری دایەوە بینی ئەواقەلایەكی دێرین لەسەر لوتكەی گردێك راوەستاوە، كتوپر چوە ناوقەلاكەوەو ئەمری فەرمو ئەوقەلایە شێوە مێژووینەكەی خوی وەربگرێتەوە، ئەوی شایستەی باسكردنە حمەپاشای جاف سالی ١٨٧٤ ئەوقەلایەی دروستكردوە.

(رەنگین)

# ڕەنگین

کۆڤارێکی مانگانەی سیاسی گشتییە

سەرنووسەر **مصلح جەلالی**

مجلة شهرية سياسية عامة
تصدرها
دار الثقافة والنشر الكوردية
بغداد

رئيس التحرير:
مصلح الجلالي




■ ڕەنگین لە گەڕەکە میللی یەکانی هەولێر دەخولێتەوە.



■ د شەڤێدا شیعر پتر بۆ من دهێت..!

د. مسعود کتانی



■ ئەزانی چۆن (ڕێبین) ڕێی خۆی دۆزی‌یەوە؟!

## فاوی بەناو

لەبەشی خوارووی‌عیراق لەنێو نیو دورگەیەکی (شط العرب)دا شارۆچکەیەکی خنجیلانە لەژیانێکی کامەرانی‌دا بوو.

لەناکاو ئێرانی دوژمن هێرشێکی سامناکی هێناو هەزارانی لێ کوژراو ویستی ئەو نیودورگەیە قوت بدات، بەڵام وەك درك چەقی‌یە قورگی‌یەوە، سەرۆکی فەرماندە صدام حسین بڕیاری رزگاربونی‌دا، سەربازە نەبەردەکانمان لە ٣٦سەعاتدا لەقورگی دوژمن دەریان هێناو ئەمەلە مێژوودا بوویە دەروازە بۆسەرکەوتنی گەورەتر.

دوژمن فاوی وێرانە کردبو، سەرۆکی فەرماندە بڕیاری دروستکردنی دایەوە، لەماوەیەکی زۆرکەمدا بە ئاهەنگێکی گەورە شاری فاو سەرلەنوێ لەجاران خنجیلانەتر دروستکرایەوە، ئیتر (فاو) بوویە نموونەی سەرکەوتن وخۆبەخت کردن ودروستکردن و ناوی کەوتە لاپەڕەکانی مێژووە.

●ڕەنگین●


ڕەنگین

ناونیشان
بەغداد
دەزگای ڕوشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە، تەنیشت، المعهد القضائي
ت ٤٢٥١٨٤٠ پینج خەتە
جیگری‌سەرنووسەر: ٤٢٥٧٠٢٥

نرخی ٥٠٠ فلسە

جیگری سەر نووسەر: **مصطفی نەریمان**
دەرهێنانی هونەری: نزار بەزاز

دار الحرية للطباعة
بغداد



# زەماوەندی فاو

## شایەدی سەردەمی هێزی خۆویست و یادکردنەوەی هەمیشەیی خوێنی شەهیدانە

ڕۆژێکی گەشی شکۆداری مێژووی عیراق و مێژووی نەتەوەی عەرەب ، ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی تشرینی یەکەم بوو، کە لەو ڕۆژەدا عیراقی یەکان زەماوەندی شارە دلێرەکەیان شاری ڕزگار کراوی (فاو)یان گێڕا ، دوای ئەوەی بەرگی بووکێنیان لەبەر کرد لە جیاتی ئەو بەرگەی کە بۆمباو ساروخی دوژمنی داگیرکەری تاوانبار لە بەری دادری بوو، شالاوی درندانەی دوژمن نە نرخی مرۆڤایەتی لاهەبوو، نە حورمەتی شوێنی پیرۆزو بیروباوەڕی دەزانی، هەرچی هەبوو وشک وتەڕ دای گرت و هێلنجی هەناوی پڕ لە قین و تاوانی فارسانەیان هەڵڕژاندە سەر داروبەردی ئەم شارە، هەتا ئەو ڕۆژەی پێش ساڵ و نیوێک فاوی نازدار ڕووی سووری خۆی بەرز



کردەوەو لەداوی داگیرکەران رزگاری بوو، بەرگێکی نوێی پۆشی کە بە دەست و ئارەقەی ناوچەوانی رۆڵەکانی عیراق چنراوە، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت هەروەکو سەرۆکی فەرمانده صدام حسین خوا ئاگاداری بێت فەرمەووی : رێگەی ئاواکردنی فاو شەرەفی تەواوکەری شەرەفی رزگار کردنی‌یەتی.

رۆژی رزگارکردنی شاری گیانبازی‌و دەرکەی سەرکەوتنی مەزن نەخشەی سەرەتایەکی گەشی زنجیرە سەرکەوتنێك بوو کە بوونە مایەی ئاشتی‌یەکی پڕ لە هێزو توانا. . ئاشتی بەری رەنجی عیراقی‌یەکان بوو و مافی کەسی دی پێوە نەبوو.

هەر بەم جۆرەش کە ئەمڕۆ ئاواکردنی(فاو)بەدەست و مەچەکی رۆڵەکانی عیراق تەواو دەبێت بەڵگەیەکی تری توانای دەرەتانی عیراقی‌یەکانە لە شەڕو ئاشتی‌و لە کوشتارو بنیات نان دا.

سەرکردەی فەرماندە لەو وتارە بەنرخەدا کە بە رۆڵەکانی عیراقی راگەیاند، بە بۆنەی دواهاتنی هەڵمەتی ئاواکردنەوەی فاودا فەرمووی : (ئەمڕۆ رۆژی فاوە، رۆژی رزگار کردن و گیانبازی‌یەو رۆژی ئیش کردن و بنیات نانە.)

عیراقی یەکان بەم فەلسەفە بەرزەی کارکردنە دەستیان دایە ئاواکردنەوە، کەوا ئاواکاری دیوی دووەمی رزگاری‌و تاقیکردنەوەی هێزو توانستەکانە. . هەر دوو دیوی یەك پارەیە کە شکۆی عیراقی مەزنە، ئەو شکۆمەندی‌یەی کە لە سەرێکەوە تێ بڕوانی توانای جەنگاوەری قارەمانانەو قوربانی‌یە پیرۆزەکانی رۆڵەکانی عیراق دەبینی، لە سەرەکەی تریشەوە توانای رەنج دان و کۆشش و خەباتی عیراقی‌یەکان دەبینی لە کۆڕی ئاواکاری‌و شارستانیەتی‌و پێشکەوتن دا. . ئەم تواناو لێهاتوویی‌یەی عیراقی‌یەکان رەمزو نیشانەی کەسایەتی نوێی عیراقی‌یە کە بە خۆی‌دا دەپەرموێ‌و یارای ئەوەیە لە کاروانی پێشکەوتن دا هەمیشە بەرەو پێشەوە رێ بگرێ.

ئەم وێنە گەشەی ئەمڕۆی شانازیی رۆڵەکانی دوارۆژمانەو مایەی

بەگوڕخستنی ڕێرەوتە مەزنەکەیانە بەرەو هەتاوی سەرکەوتن و نەمری . داستانی ئاواکردنی فاو چاکترین نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە کە عیراق شایانە لە ڕیزی پێشەوەی بنیاتی شارستانی مرۆڤانە شوێن بگری .

## میوانانی زەماوەندی فاو

زەماوەندی فاو هەر زەماوەندیکی عیراقیانە نەبوو بەڵکو زەماوەندیکی نەتەوەیی بوو چونکە پلەو پایەی فاو لە دلی ڕۆڵەکانی نەتەوەدا همیشە بەرزەو بەرز بووە، بۆیە سەرکردەکانی نەتەوەی عەرەب و نوێنەرەکانیان لەم ئاهەنگە پیرۆزەدا بەشداریان کرد، کەوا بوونە میوانی سەرکردەی ڕەمز صدام حسین خوا ئاگاداری بێت. لە پێشەوەیان سەرکردەکانی دەوڵەتی ئەنجومەنی هاوکاری عەرەب بەڕێز حسنی مبارك سەرۆکی کۆماری میصری عەرەبیو خاوەن شکۆ مەلیك حسین بن طلال مەلیکی مەملەکەتی ئوردنی هاشمیو عەقید علی عبدالله صالح سەرۆك کۆماری یەمەنی عەرەبی ، دوای ئەوانیش بەڕێز حسن جولید سەرکۆماری جیبوتیو عەقید معاوية ولد سیدی أحمد الطایع سەرۆکی لیژنەی سوپایی ڕزگاریی نیشتمانیو سەرۆك دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی موریتانیا و فەریق عمر حسن أحمد البشیر سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی ڕزگاریی نیشتمانی لە کۆماری سودان و بەڕێز یاسر عەرەفات سەرۆکی دەوڵەتی فەلەستین . جگە لەمانە نوێنەرانی مەلیك و سەرۆکەکانی هەرێمەکانی عەرەب میوانداری کران، هەروەها بەڕێز شاذلی القلیبی ئەمینداری گشتی جامیعەی عەرەبی گشتیان لەگەڵ سەرۆکی سەرکردە صدام حسین و لەگەڵ گەلی عیراق لە گۆڕەپانی ئاهەنگێڕان لە بەغدا بەشداری زەماوەندی فاو بوون .

ئەوەی شایانی باسە ژمارەیەکی زۆر نوێنەرانی پارت و کۆمەڵەو ڕێکخراوی سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەلایەتی لە دەوڵەتانی براو دۆست و ژمارەیەکیش لەناودارانی عەرەب و بیانی ڕۆژنامە نووس و نوێنەرانی دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە جیهان دا میوانی ئەم زەماوەندە بوون .

بەڕێز شبلی العیسمی ئەمینداری گشتی یاریدەری حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالست و بەڕێز عزة ابراهیم جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش و بەڕێز طه یاسین رمضان جێگری یەکەمی سەرۆك وەزیران و ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەنجومەلی شۆرش و ئەندامانی سەرکردایەتی هەرێم و وەزیران و ئەندامانی سەرکردایەتیی گشتی هێزی چەکدارو کاربەدەستانی سوپایی شاری ، لە ئاهەنگەکەدا بەشداربوون .

## ئاهەنگی زەماوەندەکە لە چەند دێڕێك دا

● یەکەم جار تیپی سوارەی ئالا هەڵگر خۆیان نواند کە وێنەیەکی گەورەی سەرکردەی بەڕێز صدام حسین یان هەڵگرتبوو.

● خەڵگەکە بەگشتی بەیاننامەی ژمارە (٣١٤٧)ی ڕزگار کردنی فاویان خوێندەوە کە ڕۆژی ١٨ی نیسانی ١٩٨٨ لەلایەن سەرکردایەتیی گشتی هێزە چەکدارەکانەوە بلاوکرایەوە .

● ڕۆڵەکانی گەلی کوردیشمان نموونەی هونەری ڕەنگینی کوردستانیان لەو ئاهەنگەدا پیشان دا، چالاکییەکانی تیپی پارێزگای سلێمانیو هەولێر و دهۆك، بەتایبەتی هەڵپەڕکێ شایی کوردی مایەی ڕەزامەندیی گشت بوو.

● پۆل پۆل کۆتری سپی ئاشتی لە کۆڕەکەدا بەرەڵلا کران و ئاسمانی ئاهەنگەکەیان بە ڕەنگی سپی پاکانە ڕازاندەوە .

● مندالانی عیراق بەخۆو بەرگی سپییانەوە بەخێر هاتنی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین و میوانە بەڕێزەکانی سەرکردەی خۆشەویستیان کرد .

● قوتابیانی هێزی ئاسمانیش چەند تابلۆیەکی ڕەنگینیان لەپشتەوە پیشان دا .



## هەڵبژاردە لە وتارەکەی سەرۆکی فەرماندە ، بەبۆنەی دواهاتنی هەڵمەتی ئاواکردنەوەی فاوەوە

* ئاواکردنەوەی فاو بەو شێوەیە کەنە دەستی بێگانەو نە پسپۆڕیی بێگانە بەشداری تێدا نەکرد، دەرگایەکی بەرچاوە لە دەرگاکانی عیراقی نوێو شاهیدێکە لە شاهیدە فرەکانی ڕاپەڕینی لە ڕێگای ئاواکردن و دووپات کردنەوەی دەوری مرۆڤانەو نیشتمانیو نەتەوەیی دا لە چەرخێکدا ئەگەرمرۆڤەکە لە ئاواکردن و بنیات نان دا هەڵکەوتوو نەبێت مانایەکی نایاب و دوارۆژیکی دیارو گەش و سوگەری تێدا نابێت .

*وا فاوی قوربانیو گیانبازی گەڕایەوە لاتان بە پۆشاکی جوان ڕازاوەتەوە کە لە برژانگی چاو و ئارەقەی مەردان و ئەوەی لە پێداویستییەکانی ژیان داتان بریوە دروست بووە، دوای ئەوەی بە خوێنی گەشی پاك ڕزگارتان کرد .

ڕێزان



# بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی گشتی سلێمانی:

## * ئەمساڵ قوتابخانەی برین پێچی دەکەینەوە

## * هەر نەخۆشێک هەر کەم و کورتیەک ببینێت ئاگادارمان بکەن

## * خزمەتکردن بەرامبەری هاوڵاتیانە

## * ئەوەی ... نەخۆشمان هەیە

ئامادەکردنی

هێرش محمد ئەمین

دوای تێپەڕبوونی بۆ ماوەی نەخۆشێک ڕووم کردە نەخۆشخانەی گشتی سلێمانی هەر لەدوورەوە هەست بە جوانی و پاک و خاوێنی ئەم شوێنە دەکەیت کە دەچیتە ناوەوە دەبینیت گوڵ و گوڵزار و چیمەن و سەوزە گیایەکە مەگەر هەر باخچە نموونەییەکان وابن.. بێ گومان ئەمەش مایەی دڵ خۆشی و جۆرە شادمانییەکە بۆ نەخۆش و کاردەکاتە سەر هەست و دەروونی نەخۆش و میوانی ئەم نەخۆشخانەیە، بۆیە لە لای خۆمەوە بڕیارم دا ڕیپۆرتاژێک دەربارەی ئەم نەخۆشخانەیە بنووسم هەوڵی بەڕێوەبەرەکەی (د. جەمال عمر توفیق)م پرسی و لەژوورێکی بچکۆلەدا ئەم دیدارەمان لەگەڵ سازکرد.

*دکتور نەخۆشخانەکەتان کەی دامەزراوە؟

- ئەم نەخۆشخانەیە لە بنەڕەت دا بەشی ناوخۆیی بووە لەساڵی ١٩٨٢دا کرا بە نەخۆشخانە هەوڵێکی بێ پایانمان دا تاوەکو بیکەینە نەخۆشخانەو لایەقی ئەوەبێت نەخۆشی تیا چاک دەبێتەوە، وابزانم خۆتان گەڕان و بینیتان و دەشتوانن پرسیاریش لە نەخۆشەکان بکەن بۆ چۆنیەتی خزمەتگوزاری.

*بەشەکانی نەخۆشخانەکەتان چین؟

بەشی( نەشتەرگەری، ناوسک، دەروونی و دەمارەکان تیشک، تاقیگە)مان هەیەو لە هەموو بەشەکان دا باشترین و نوێترین ئامێری پزیشکیمان هەیە، لەگەڵ ئەمانەش دا جێگەی خەوتنی ٣٦٠ نەخۆشمان هەیە.

* هەموو ڕۆژێ نەشتەرگەریتان هەیە:

بەڵێ هەموو ڕۆژێ بەپێی نەخشەی خۆمان هەر بەشەو بەپێی نەخۆشەکانی نەشتەرگەرییان هەیە.؟

*ئەو حاڵەتە دەگمەنانەی ڕووتان تێ دەکەن:

هەموو هەفتەیەک کۆبوونەوەی تایبەتیمان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لەو حاڵەتە دەگمەنانەو شێوەی چارەسەر کردنی بەشێوەیەکی گونجاو، دواهەمین لێکۆڵینەوەمان لەسەر ئەو چەند ئافرەتە بوون کە هەست دەکەن پیاون یاخود بەپێچەوانەوە چارەسەری پێویستمان بۆ دانان.

* ئەو نەخۆشییەی تێستا بڵاوەو چارەتان:

نەخۆشی سک چوونە بۆ ئەمەش خێرا نەخۆش دەخەوێنرێت و چارەسەری بۆ دادەنرێت کەس و









کارو دەوروبەری دەخرێنە ژێر چاودێرییەوە فەحس دەکرێن بەهۆی ئەو تیپانەی بەرێوەبەرێتی گشتی تەندروستی سلێمانی دایناوە بۆ ئەم مەبەستە بۆ بلاونەبوونەوەی و بنەبرکردنی.

* پرسیارمان لەیەك دوو نەخۆش کرد دەڵێن خواردنەکەتان باشە ئێوە دەڵێن چی؟

- ئێمە لە لایەن خۆمانەوە درێغی ناکەین هەر کەسیش چ لە ناوەوە یاخود لە دەرەوەی نەخۆشخانە هەستی بە هەر کەم و کورتیە کرد لە پزیشك و کارگێرانی ئەم دەزگایە ئاگادارمان بکات بەهەر شێوەیەك بێت دەرگامان کراوەیە ، لەلایەن خوارد نیشەوە ئێمە سێ مانگ جارێك فەحسی چێشت کەرو چێشت دابەش کەر دەکەین

*ئەگەر زانیتان برین پێچێك مامەڵەی لەگەڵ نەخۆش دا باش نی‌یە چی دەکەن؟

- ئێمە بەپێی پلانی نەخۆشخانەکەمان مانگی پاداشت و بەخشش دەدەین بەو کەسانەی باشن لەگەڵ نەخۆش دا! ئەگەر هات و بەپێچەوانەوە بوو کەوا لێی دەبرین و سزای ئیداریشی دەدەین.

*ئەی پرۆژەی نوێتان؟!

- لەسەرەتای ئیمسال دا قوتابخانەی برین پێچی ئافرەتان دەکەینەوە بۆ دەرچووانی پۆلی شەشەمی سەرەتایی، هەر لەئێستاوە پێداویستیەکانمان بۆ دابین کردوەو ماوەی خوێندنیشیان (مخصصات)یان هەیە بە موچەیەکی باشیش دادەمەزرین لە هەمان نەخۆشخانەدا.

*هەر لەم کاتەدا د. جمال خوشکێکی برین پێچی بانگ کرد













لەوانەی دەرچووی پۆلی شەشەمی سەرەتایین و تازە دامەزراوە لێمان پرسی موچەکەت چەندە وتی ١٠٦ دینار بێجگە لە ٢٥ دینارە زیادەکەو مانگانەش کاتی خوێندن پارەمان دراوەتێ لەگەڵ جل و بەرگ دا

*ئامۆژگاریتان چییە؟

- پێویستمان بەیارمەتی هاوولاتیان هەیە کە گوێ ڕایەڵی ئامۆژگارییەکانی نەخۆشخانە بن بە تایبەتی هاتن بۆ لای نەخۆش کە بووە بەدیاردەیەکی نابەجێو زیان بە نەخۆش و نەخۆشخانەو خەڵکانی تریش دەگەیەنێت کەسانێ وا هەیە ئەگەر چوار جار بێت بۆ لای نەخۆش بێ تاقەت نابێت نازانم ئەم هاتنە چ سوودێك دەگەیەنێت بێجگە لە زیان ، بۆیە داواکارم لە هەموو هاوولاتیان هاتنیان بۆلای نەخۆش کەم بکەنەوە بۆ سەر سووکی نەخۆشەکەو نەخۆشخانەکەش.

* لە کۆتایی گەشتەکەمان بێ ئەوەی بەڕێوەبەرەزانێت چاومان بە چەند نەخۆشێك کەوت لەوانە گوڵان فرج لێمان پرسی دەربارەی مامەڵەی برین پێچ و پزیشکەکان وتی بەراستی جێی رێزن و لەیەك باشترن و هیچ گلەییەکمان نییە:

* لە خوشکە امنە محمدمان پرسی خواردنتان و پاك و خاوێنی چۆنە لەوەڵام دا وتی:

خواردنەکەمان زۆر پاك و خاوێنەو دەڵێی چێشتی ماڵەوەیە لە لایەن پاك و خاوێنیشەوە باوەڕ ناکەم هیچ نەخۆشخانەیەك وەك ئێرە وا بێت چونکە ئەمان گوڵیش دەچێنن سەرەڕای پاك و خاوێنی.

*لە کۆتایی ئەم گەشتەمان دا دەڵێین دەك ئافەرین بۆئەو کەسەی بەدڵ و دەروونێکی پاك و بێگەردەوە خزمەتی گەل و نەتەوەی دەکات

# خەڵاتی «تایەر توفیق» لە ئامۆژگای داهێنان و جوانیدا





١٩٨٩/٦/١٥ . . رۆژێکە لەو رۆژە پڕ چێژ و جوانی‌یەی کە لە ئەرشیفی پڕ شانازی ئامۆژگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی‌دا . . دیارە.

●●●

سەربوردەی خەڵاتەکە:

ساڵی پار . . لەیادی یەکەمی کۆچی دوایی هونەرمەندی گەل «تایەر توفیق» . . . دوای ئەوەی مامۆستا محمود زامداری رۆژنامەنووس بەوپەڕی لەخۆبووردوویی ئەو یادە گەورەیەی رازاندەوە . . هەر لەو کاتەش دا کاك فکرت عزتی پارێزەر کە بە «خەمخۆر و برای بەوەفای هونەرمەندان و نووسەران» ناسراوە بیرۆکەیەکی پیرۆزی بە مێشك دا هات . . کە پوختەکەی بەم جۆرەبوو:

«هونەرمەندێکی کورد خەڵاتێکی وا دروست بکات کە تەعبیر لە هونەر و رەسەنایەتی مام تایەر بکات و ئەم خەڵاتەش لە ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیانی ئامۆژگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی . . پێشکەشی ئەو قوتابی‌یە بکرێت کە لەبەشی مۆسیقادا پلەی یەکەمین وەدەست دێنێت».

بۆ ئەم مەبەستە . . کاك فیکرەت رووی لە شاعیر و هونەرمەند کاك فازیل شەورۆ کرد کە ئەو خەڵاتە دروست بکات، کاك فازیلیش بەوە ناسراوە کە هونەرمەندێکی یەگجار دەست رەنگینە لە دروست کردنی ئەو جۆرە شتانەدا.

ئەمساڵ . . پێش ئەوەی ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیان دەست پێ بکات . . کاك فیکرەت بەخۆکەوت و . . . هاورێ دەگەڵ ئەم بەرێزانە روویان لە شارەکەی حاجی قادر کرد:

● مامۆستا زامداری رۆژنامەنووس و سیڤەری کوری

● مامۆستا وریا ئەحمەدی هونەرمەند. ١

●کاك جیهان بە خشی هونەرمەند.

●کاك هاشم سەراجی شاعیر.

● کاك بورهانی ئەندازیار و نووسەر.

● کاك حسن گەرمیانی هونەرمەند و بێلان ی کوری.

● کاك سادق حەریری هونەرمەند.

● کاك لوقمان جەوهەری

● کاك لوقمان جەوهەری هونەرمەند.

● کاك ئامانج غازی هونەرمەند.

● کاك صباح فەیزی هونەرمەند.

● کاك لوقمان بەرزنجی هونەرمەند.

● نووسەری ئەم چەند دێرەش.

لە کۆیەش دا ئەم بەرێزانە چاوەنوار بوون:

● مامۆستا سەرداری هونەرمەند

● کاك فازیل شەورۆی شاعیر و هونەرمەند.

● کاك ئارامی شاعیر.

ئیتر سلێمانی‌ی جوان . . خۆت بگرە و هاتین.

. . بەڵی ١٩٨٩/٦/١٥ . . لە سەعات ٦ی دەمەو ئێوارە . . لە هۆڵی ئامۆژگادا ئاهەنگی دەرچوون دەستی پێ کردو خەڵاتی «تایەر توفیق» بەنەسیبی کاك «حەمەشوان» بوو کە لە بەشی مۆسیقادا پلەی یەکەمینی وەدەست هێنا.

کاك سادق هەریری هونەرمەندیش بەیادی مام تایەر هۆڵەکەی هەژاندو بەدەنگە سازگارەکەی ئامادەبوانی دڵشاد کرد!

کا فازیل شەورۆ دەربارەی ئەم خەڵاتە گوتی: «قەبارەی خەڵاتەکە ٣٠×٣٠×٣٥ سم» ٥ ماوەی دروست [illegible] سەعاتی خایاندووە، لە بەشی سەرەوەی‌دا نیوە بازنەیەك لە شکڵی پەلکەزێرینە بە هەموو رەنگەکانی‌یەوە دیارە، لەبەشی خوارەوەیدا نوتەی گۆرانی - نەسرین ئەمرۆ نەورۆزە - لەلایەن هونەرمەندی لاو - سەرتیپ أحمد - تۆمار کراوە، لەژێر پەلکەزێرینەکەدا ئامێری ساز چەسپ کراوە لەسەر تاشەبەردێك، لەلای راستی ئامێرەکەوەش خەنجەرێك بەقەدی شاخێکەوەیەو سازەکەی لە ئامێز گرتووە، بەردەکانیش لە «سەر تەم تەمان» هێناومن . . ئەو شوێنە بوو کە مام تایەر لە تافی لاوی لەناو باخ و رەزەکانی کۆیەدا کاتی تێدا بەسەر بردووە، هەموو ئەو شتانەم لەسەر پارچە قوماشێك داناوە کە بەشێك بوو لە پشتێندەکەی خاڵەتایەر.»

بەمجۆرە لەگەرمەی شایلۆغانێکی پڕ ئەشق و حەسرەت دا . . گیانی زیندووی تایەر توفیق بەسەر ئەزمر و گوێژەدا وەك پەپوولە باڵەفرەی دەکرد.

دروود بۆ ئەو کەسانەی کە بە هەوڵی تاکەکەسی و دوور لە پاداشت . . هەڵس وکەوت دەگەڵ هونەری رەسەن دا دەکەن.

بەهیواین کە ئەم هەوڵە پیرۆزانە بینە عادەتێکی ساڵانەو گیانی زیندووی داهێنەرانی یان پێ شاد بکرێت.

ئامادەکردنی

● اسماعیل انور بەرزنجەیی ●

ڕەنگین دەگەڕێ و دەپرسێ:

# •بۆچی شارەوانی هەولێر چاوی لەم وێنە تاڵانە پۆشیوە

# •ڕەنگین لە نێوان هاوولاتیان و لێپرسراوان..

# •بۆچی ٤٠٠٠ خانوو بێ تاپۆیە

• شێرزاد عبدالرحمن •



بەڕێوەبەری شارەوانی لەنەخشەی پاشەڕۆژی هەولێر دەدوێ!



بەڕێوەبەری خزمەتگوزاری؟

هەولێـــر گەورە بووەو ڕۆژ بە ڕۆژ فراوانتـــر دەبێـت. . ئەوەی دێتـــە هەولـێـــر، هەســـت دەکـــات، گۆڕانـێـکی چاك لەبـیـنـــاو دام و دەزگـاكانیدا هاتۆتە کایەوەو هەوڵ و کۆشش بەردەوامـــە بۆ جوان کردنی شارەکـــە. . بەڵام زۆرجـــار، دیمـــەنی‌وا دەبینین کە لەگـــەڵ ئەو گۆڕان و پێشکـــەوتنـــە یەکتـــرنـــا-گرێتـــەوە. . ڕۆژنـــامـــەنـــووسی کوردیش دەتـــوانێت بەشـــداری لە خزمـــەتی خەڵکی‌دا بکـات. . لـەم پێـودانگەوە. . (ڕەنگین) دەگەڕێ‌و بەرامبـــەر بەدیمـــەنـــە تاڵـــەکـــان ڕادەوەستێ‌و دەپرسێ (بۆچی) ؟ ماوەی هەفتـەیـەك بۆ ئەم ڕیپـۆرتاژە گەڕاین و سوڕاین. . . لەوکۆڵان بۆ ئەوکـــۆڵان. . . لـــەو گەڕەك بۆ ئەو گەڕەك. . . دەمـــان بینی‌و دەمـــان پرسی‌و وێنـەی‌تاڵمـان تۆمار دەکردو پاشان دەمان خستە بەر دەم لێپرسراوان.



بۆچی!



خانووە، یان زبڵخانە



پشت نەخوشخانەی منالآن!!



گەڕەکی پیشە سازی..

## ●ئەم دیمەنەتالانە...!!

کە لەشەقامەکانی هەولێر دەگەڕێین، هەڵوێستە بەرامبەر بە هەندێ دیمەنی تاڵ دەکەین.. لە دیارترین ئەوشتانەش ڕێك نەخستنی شار لە ڕووی هاتوچۆوە، یان لێنەپرسینەوە لە هەندێ دیمەن کە هەرکەسە و بە ئارەزووی خۆی ملی داوتە بەر شتێك و بەبێ ئەوەی شوێنەکە لەگەڵ ئەو کاسبی‌یەدا بگونجێت...

زۆر لە گەڕەکەکان پڕن لە زبڵ.. هەندێ جار بە هەفتە زیاتر هەڵناگیرێن.. باخچە گشتی یەکان دەرگایان داخراوەو لە بەر دەمیان دا چەندان عارەبانەوەستاوەو کوتاڵ و شووتی دەفرۆشێ.. هەندێ گەڕەکێ هەیە دەستی شارەوانی نایان گاتێ... تاکو ئێستا لە شارێکی وەکو هەولێر شوێنی تەواو بۆ ڕاوەستانی ئوتومبێل نیە!!

لەوش تاڵتر، دیمەنی زبڵخانەکانە کەلێرەولە وێ دەبینرێن و دیمەنی شارەکەیان شێواندووە!

## ●ڕەنگین لە گەڕەکە میللی‌یەکان...

کە دەستمان بەگەشتە کە کرد، لە گەڕەکە میللی‌یەکانەوە دەستمان پێ کرد.. لێرەدا ناتوانین بەدرێژی باسی هەموو گەڕەکەکان و



وێنەیەکی تاڵ لە خۆی ئەدوێ



ڕەنگین خەمی هاوولاتیان تۆمار دەکات!



ئەمە بەردەم باغی شارە!!

گیروگرفتەکانیان بکەین (چونکە ئەمەمان کرد بەراپۆرتێك پێش کەش بە شارەوانیمان کرد)..

لەو گەرەکانە، خەبات، شورتە، زانیاری، شەهیدان، شۆرش، کرێکاران، تەیراوە، بەستە پیازە، باداوە.. هتد.

لە هەریەکێك لەو گەرەکانە لەگەڵ هاوولاتیان وەستاین.. خەمی خۆیان دەربری کە بریتی یە لە زبڵخانەو قیرتاو نەکردن وبون و پیسایی وزبڵ و پشت گوێ خستنی هۆیەکانی خزمەتگوزاری...

لە سەرە رێگای (٦٠)مەتری، لەبەردەم کۆڵانێك وەستاین، هاوولاتی سعید قادر ئەڵێ:

هەمو مانگێك نیوەی مووچەی مانگانەم بۆدوکتۆرو خەستەخانەیە ئاوی (٥) گەرەك دێتە ئەم جادەیە،

لەگەرەکی باداوە، خوشکە سعدیة محمد ئەڵێت: بروات بێت، دە رۆژ زیاترە ئوتومۆبێلی پاك کردنەوەو زبڵ نەهاتووە بۆ ئەم گەرە کە!!!.

لە گەرەکی کرێکاران، کاك صلاح احمد ئەڵێت رۆژنیە ئێمە نەچینە شارەوانی تاکو گەرەکەکەمان لەزبڵ و بۆن رزگارکات، بەڵام بەداخەوە...!!!.

## ●گەرەکی پیشە سازی بۆوایە

لەگەرانەکەدا، چووینە گەرەکی پیشە سازی چاك کردنەوەی ئوتومۆبێل. ئەو کەسەی کە خوانە خواستە ئوتومۆبێلی نەخۆش بێت، لەوێ لەبەر نەبوونی قیرتاوو کەندی زۆر ناتوانیت رێ بکەیت... دەیان ئوتومۆبێل فرێ دراون.... جگە لەو زبڵخانە گەورەیەی کە کۆڵانەکانی داپۆشیوە!.

لەوێ زۆر لە برا کرێکارەکان هاتنە لام.. هەریەکە خەمی خۆی دەربری (کردمان بەراپۆرتێك بۆشارەوانی هەولێر).

## ●لێخورە دەشتە!

لە ناو بازارو لەبەردەم (باغی شار)دەیان عارە بانە وەستاون.. بازارێکە بۆخۆی.. شووتی.. کالەك.. کوتاڵ.. پاکەت.. بۆیاغ چی... تاد.

زۆربەشیان بەبێ مۆڵەت و لێپرسینەوە.. تۆزێك بەولاوەتر-یش، دەلاڵ خانەیەکەو هەرچی پاشماوەی چێشتخانەی ئەو ناوەیە لەوێ فرێ دەدرێت!!.

## ●گیروگرفتەکان لەبەردەم شارەوانی..

دەربارەی ئەو کێشانەوچەندان شتی تر، راپۆرتێکی فراوانمان ئامادەکرد.. پەیوەندیمان بەشارەوانی هەولێرکرد، ئەوانیش بەسوپاسەوە، ئێوارەیەکی دەوامی خۆیان تا درەنگی شەو بۆ ئێمە تەرخان کردو پێشەکی سوپاسیان دەکەین.

لە سەرەتادا بەرێز ابراهیم خانەقینی بەرێوەبەری خزمەتگوزاری ووتی: دەربارەی راپۆرتە کەتان، بە لێتان پێ ئەدەین کە کەم تەرخەمی نەکەین.. ئەوەی کە لەراپۆرتەکەدا هاتووە، بەڵێن پێ دەگەرێین و ئەوەی لە تواناادا بێت بە جێیان ئەهێنین.. پاشان ئەمانەمان پرسی:

● پاشماوەیەکی زۆر لەناو بازاروکۆڵانەکاندا هەیە؟

+ بروات بێت، شارەوانی مانگی (٣٠ )هەزار تەن فرێ ئەدات.. بەشەوو رۆژ ئوتومۆبێلەکانمان لەئیش ناکەون!!.

## ● ئەی قیرتاو کردن؟

+ بەشەکانی شارەوانی بە هاوکاری لەگەڵ یەك هەڵمەتێکی گەورەیان ئەنجام داوە، بەڵام تۆخۆت ئەزانی چ گۆران و فراوان بوونەوەیەك لە هەولێر روویداوە وفریای ناکەوین..

## بۆچی شوێنی وەستانی ئۆتۆمۆبیل نی یە؟؟

+رێگەمان به هاوولاتیان داوە کە گەراج بکەنەوە.. ئێمەش گەراجی نیشتمان)مان هەیە... بەڵام تێ بینی یەکە هی ئەوەیە بیری زیاتری لێ بکەینەوە. بۆ چارەسەری ئەوەیە، رێگە دراوەکە (سایدی قەلا) ئوتومۆبێل بووەستێت..

● ئەی ئەو ئاژاوەیەی لە پێش (باغی شار)هەیە؟.

+(تەماشای وێنەکانی کرد): ئەمانە هەمووی راستن بەڵام ئەو ناوچەیە تێك دەدرێت وئێستا دەست کراوە بەروخانی دوکانەکان.؟

● گلەیی هاوولاتیان لەناوچەی (پیشەسازی)زۆرە..؟

+ ناوچەی باکووری ئەم گەرەکە، بەراستی دوواکەوت.. ئێستا دو ترا کتۆرمان لەوێ داناوە، بەڵام لەسەر داخوازی ئێوە زیادی ئەکەین!

●هەست ناکەن کە قەلا پشت گوێ خراوە؟

+ ئەمەیان پەیوەندی بەپرۆژەی پێشکەوتنی قەلاوە هەیە.. بەڵام ئێمەش لە رووی خزمەتگوزارییەوە..

● ناشێ هەندێ دوکانی جوان و گازینۆی بەدەوردا دروست کەن؟

+پێشنیارێکی بەجێیە!

●ئەی دیاردەی جگەرە فرۆشتن؟

+ بروات بێت ئێستا لە شارەوانی سێ (مخزن) پاکەت گیراوە..!!.

تا کۆتایی شەو، واتە (١٢)ی شەو، هەر لەگەڵ بەرێزتحسین چیچو بەرێوەبەری شارەوانی قسەمان کرد..

ئەو، پێش پرسیارەکانی من ووتی: بێگومان هەر گیروگرفتێك کە بمانەوێ چارەسەری بکەین، پێویستمان بە یارمەتی و هاوکاری هاوولاتیان هەیە.. بۆنموونە، لەزۆرکۆڵان وگەرەك (حاویە)مان داناوە، بەڵام خەڵك راهاتووە کە زبڵ فرێداتە بەر دەرگا.. تەنیا لە هەولێر (١٢٠ ) مان هەیە (٦) ئوتومۆبێلیش بۆ فرێ دان..

● مامۆستا گیان، هەندێ جار کرێکارەکانتان زبڵ دەسووتێنن... ئەمە زەرەری زۆرە.. بۆچی سنووری بۆدانانرێ؟

+ئەمە قەدەغەیەوەئەنجامی خراپی هەیە.. هەندێ کرێکار بەنەفامی کاردەکەن.

● باسی سەرناپای گیروگرفتەکانمان، لەگەڵ بەرێوەبەری خزمەتگوزاری کرد..

لەراپۆرتەکەی بەرێزت دەکۆڵینەوە. بەڵام هەولێر ئەوەندە گەورە بووە کە ئەرکی ئێمەی قورستر کردووە..

● ئەمەوێ ئەوە لە جەنابتان بپرسم.. کە بۆچی (٤٠٠٠) هەزارخانوو لە گەرەکی باداوە بێ تاپۆیە.. بۆچی؟

+ لێژنەیەکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە داندراوە.. هەوڵ و کۆششمان بەردەوامە بۆنە هێشتنی ئەو وێنە تاڵانەی باست کرد..

سوپاسیش بۆ ئەم بەسەرکردنەوەیە.

● شایانی باسە کە زۆر لەو وێنە تاڵانەش دوا بە دوای رپۆرتاژەکە، یەکسەر چارەسەرکران.

# نموونەیەکی نووسینی کوردی نێوان فەرمانگەکانی هەولێر لە ساڵانی سیدا

نووسینی کوردی لە کوردستان بەتایبەتی لە هەولێری لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا بە پێی بریاری نەتەوە یەکگرتووەکان و یاسای زمانە ناوچەییەکان، کە ناوچە کورد نشینەکان بە زمانی کوردی بنووسن و بدوێن، بۆ ئەم مەبەستە سکاڵانامەی نێوان فەرمانگەکان و نووسراوی رەسمی بوو بەزمانی کوردی.

ئەم نموونەیەی، کە لێرەدا دەیخەینەروو نموونەیەکی ئەو سەردەمەیە، نووسینەکە بە رێنووسی بڵاودەکەینەوە بۆئەوەی خوێندەوار سەرنجی رێنووس و زمانەکە بدات:

-١٩-

متصرفية لواء اربيل

العدد ٤٦٩٤

اربيل في ١٩٣٨/٥/١

قلم المحاسبة

الى :- قائمقام قضاء رواندوز

الموضوع ترفيعى تحصيلدار

نیشانه به به كاغذ تان زماره ١١٣٤ روژ ١٩٣٨/٤/١٧
نظر به منشور اخيرى، وزارة ماليه بو ترشيحى ترفيعى موظفين لمولا مساغ نماوه وله وقتى خويدا
ناوى مومى اليه له قائمه ترفيعاتدا درج كراوه وامید اكه ين لباشى تصديقى مزانيه ترفيعى
اجرا بكرى، لطفا كيفيت بو صورته به مستدعى سيد بشير تفهيم بفرمون .

متصرف لواء اربيل

صورة :- بو محاسب لواء لگل استدعاء، مومى اليه .

نیشانەیە بە کاغذتان ژمارە ١١٣٤ روژ ١٩٣٨/٤/١٧
نظر بە منشور اخیر وزارة مالیە بو ترشیحی ترفیعی موظفین لمولا مساغ نماوەو لە وقتی خویدا ناوی مومی الیە لە قائمە ترفیعاتدا درج کراوە و امید اکەین لباشی تصدیقی مزانیە ترفیعی اجرا بکری لطفا کیفیت بو صورتە بەمستدعی سید بشیر تفهیم بفرمون.

سەرنجێك:

وەکو لە زۆربەی دەستنووسەکان دا سەرنجم داوە هەوڵی ئەوەیان داوە زمانێکی یەکگرتوو بۆ نووسین بێنەکایەوە. لە رەواندزو مەخموور و ناوەندی هەولێردا نووسراوە (نەکەم)نەوەکو (دەکەم)، یان (بۆ) بەکارهاتووە نەوەکو (لێ)...

ئامادەکردنی
● هیمدادی حوسێن ●

# که فلیمی مەم وزین



هونـەرمـەنـد ناصـر حسـن دەرهێنەری مەم و زین.



حافظ العادلي - سیناریۆ

## لەدایك دەبێت؟

لەم رۆژانـەدا گفـت وگـۆ بەردەوامـە لەسـەر ئەوەی خەڵکی دەپـرسـی، ئەری مەم و زیـن کەی لەدایـك دەبێت؟ دوادەنگوباسی ئەو فلیمـە کوردیـیـە چی‌یە کە چەندان ساڵـە هونـەرمـەنـدو بینەرانی کورد خەونـی پێـوەدەبـینـن؟ ئەوەبـو (رەنگین)ئـامـادەی ئەو کۆرەفراوانە بووکـە بەدرێـژی سێ رۆژلـە هۆڵی ئەمـانـەتی رۆشـنبیـری‌و لاوان دەربـارەی ئەم بەرهـەمـە سازکـراو تیـایـدا ژمارەیەکی زۆر هونەرمەندو مێژووناس ونـووسـەرو ئەندازیار ئامـادەبـوون بۆ گفت وگـوکـردن دەربـارەی لایـەنـەکـانی ئەو فلیمـە وهەوڵدان بۆ هێنانەدی ئەم خەونە پیرۆزە.

دوای ئەو کۆرەو چاوپـێـکـەوتـنی رەنگین لەگـەڵ بنـەماڵە ی‌مەموزین ئەمانە گەڵاڵە بوون:

● ئەم نۆبەرەیە لە سینەمای کوردیدا یەکەم هەنگاوەو لە سەرەتای بەهاری ١٩٩٠لە کوردستان دەست بەتـۆمارکردنی دەکری‌و تاکو ئیستـا(٣١٠) هەزار دینـاری بۆ تەرخـان کراوە، جگـەلـەو دەسـت پێشخـەریـیـەی مامـۆستـا کەمال یامولکی کەپارەیەکی زۆری بۆ داناو خاتوو شەونم عادل ی هونەر مەندی کردە نوێنەری خۆی.

لەم بەرهەمەدا کە لە (مەمی ئالان)ی (روجیـە لـسکـۆ) وەرگیـراوە و د. بدرخـان سنـدی وەری گێـراوەو هونەرمەند حافظ العادلي سیناریۆی بۆ نووسیوەو رؤف حسن کردویەتی بەکـوردی‌و هونـەرمەند ناصر حسن دەری ئەهـێـنـێ ،زیـاتـرلـە (١٠٠)ئـەکتـەری کورد بەشـداری دەکـەن وزیاترلە (٥٠٠) کۆمبارسی ئەوێ. تاکـو ئیستـاچـەنـد لیژنەیەك داندراوە وئەم لیژنانە دەستیان کرد بە کارکـردن ، بەتـایـبـەتی بۆخۆ ئامـادەکـردنی تەواولـە رووی دابین کردنی پێویستی هونەری.

شوێنی وێنـەگـرتن دەست نیشـان کراوە، بەتـایـبـە تی دوای گەرانی لیـژنەی بەرهەم و سەردانیان بۆ ناوچە -کانی کوردستان.

دەست نیشـان کردنی بەهاری ساڵی داهـاتـوو بۆ تۆمـارکـردن لە پێنـاو دەرخـسـتـنی روخـسـاری جوانی کوردسـتـانـە لە لایـەك و خۆ ئامـادەکـردنی‌بەشداربوان لەلایەکی‌تر وهیـوادارین کە بە دەستی دڵسـۆزان ئەم ئاواتە بێتە دی.

● شێرزاد ●



شەونم عادل - یەکێك لە بەشداربوان

# لۆرد بایرۆن نەوشاعیرە گەورەیەی

# پاش سەدو شەش ساڵ رێزی لێگیرا



«جـۆرج گۆردن»ی ناودار بە « لۆرد بایـرۆن : Lord byron لە ساڵـی ١٧٨٨دا لە (لـەنـدەن)بـە شەلی لەدایـك بووەو، جارێ هەر ساوا بووە باوکـی مردووەو دایـکـی پەروەردەی کردووە، لە ئامۆژگاکانی «دلـۆج»و «هـارۆ»و کۆلـێـجی «تـرینیتی» خوێندوویە تیو نازناوی لۆردی لە مامییەوە بۆ ماوەتەوە.

بایرۆن شاعیرێکی شیعر ناسکی پر سۆز بووەو یەکـێـك بووە لە رابەرانی بزووتنەوەی رۆمانتیکیو لە شاعیـرە هەرە ناودارەکـانی ئینگلیـز بووە، یەکـەم دیـوانـی بە ناوی «ساتەکەنی کاری» لە ساڵ ١٨٠٧دا بڵاوکـردەوە، رەخـنـەگـرەکـان بەسـاردیـان وەرگـرت و بە کارێکی سـەرنـەکـەوتـوویان دانا. ئەمیش بە هۆنـراوەیـەکی گەپاوی بەناونیشانی [هـۆنـراوەی ئینگلیزیو رەخنەگری ئوسکـۆتلەنـدی ]لە ساڵی ١٨٠٩دا وەڵامـی دانـەوە، ئەم رەت کردنـەوەیـەی بووە هۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی شاعیریی.

ئـنجـا گەشـتێکی بۆ وڵاتـەکـانی ئەوروپـا کردو سەری لە ئیسپـانیـاو ئیتـالیـاو بەلقـان داو کە گەرایـەوە داسـتـانـێـکـی شیعـریی بە ناوی «هـارۆلـدی خانەدان»هۆنیەوە کە بە باشترین شاکاری بایرۆن دادەنرێ وناوبانگی بە هەموو ئەورپادا بڵاوکردەوە.

لە ساڵـی ١٨١٦ ژنـی هێـنـاو کچێکی لێ بوو، بەڵام دوای ساڵێك لێـك جودا بوونـەوەو، لە ئەنجامی ئەم گیـرە وگـرفتە خێزانییەو هەندێ تەنگـوچـەڵـەمەی دیکەی ژیانی ، تا هەتـایـە بەریتـانیای بەجێ هێشت و چوو بۆ شاری «جـنـێـف»ولەوێ بە شاعیـری ناوداری ئینگلیـز «شیللی ١٧٩٢ ـ ١٨٢٢» گەیشـت و بوون بە دوو هاورێی دڵـسـۆزو ئەو سەردەمـەی ژیـانی لە ئەوروپا وەکو گەرداوێـك بووو، لەنـاو هۆنـراوە کانـیدا بە جوانـی رەنگی دایـەوەو توانی داستـانـەکـەی «هـارۆلـدی خانـەدان» تەواو بکـات و هەنـدێ کتـێبی تری وەك [بـەنـدکـراوی شیبـۆن] و شانۆنامەی [ مانفرید]ی دانـاو لەنـێـوانـی ساڵانی ١٨١٩و ١٨٢٤یش دا داسـتـانی شیعـریی [دۆن جوان]ی هۆنـیـەوەو ، بە تەواناو بەهرەی خوڵقاندنی داستان و شیعری پتەوی تێدا دەردەکەوێ.

بایـرۆن لە ١٨٢٣دا چوو بۆ وڵاتی یۆنـان بۆ بەشداری کردن لە بزووتنـەوەی رزگـازی خوازیی ئەو وڵاتـە لە دژی تورکـە عوسمـانلییەکان و دەورێکی باشی لە رێکخستنی خەباتی شۆرشگێریی ئەو نەتـەوەیە ژێردەستە نواند ، تاکو لە ١٩ی نیـسـانـی ساڵـی ١٨٢٤دا تووشی گرانـەتـا بووو لە تەمـەنی ٣٦ ساڵـی دا کۆچـی دوایـی کردو لەوێ نێژرا.

ناوبـانگی باشی شاعیرییی بایرۆن بەهـەمـوو ئەوروپـادا بڵاوبـوەوە بەتـایـبـەتی لە (فـەرەنـسـا)و هۆنـراوەکـانی بوون بە سەرچـاوەی سروشـی زۆربـەی نووسـەرو وێنەکیشـەکـانی ئەو وڵاتـەو پتر لەو وڵاتـی خۆی مافـی رەوای خۆیـان پێدا چونکـە دەوڵـەتەکەی خۆی چ رێـزێکی لێنەناو تەرم وگۆرەکەیشی پشت گوێ خست تاکو دوای مردنی بە (سـەدو شەش)سـاڵ یەکێـك لە رۆژنـامـەکـانی لەنـدەن لەژێـر ناونـیـشـانـی [ باوەردەکـەی یان ناکـەی؟!]دا، وێـنـەیـەکـی کاریکـاتیـری لە ٣٠ی تەمـووزی ساڵ ١٩٣٠دا بڵاوکـردەوەو، ئەم وتـەیـەیشی لە گەڵ دا نووسی بوو کە دەڵێ [(پـۆتـسواین) ی سەگەکەی «بـایـرۆن»ی شاعیـری گەورەمـان گۆرێـکـی گەورەی هەیـە، کەچی شاعیری مەزنمان خۆی بێ گۆرە!!].

ئەم وێنـەو وتـەیە کارێکی گەورەیان کردە سـەر هەسـت و هۆشـی رۆڵـەکانی قوتابخانەکانی سەرتاپای بەریتانیاو ئەمەیان بە شکاندن و نرخ نەزانینی شیعـرو شاعیـرییـەتی بایـرۆن زانی کە میـریی دەرحـەقی کردووە و، پارەیـەکـی زۆریـان کۆکردەوەو داوایان لە حکومەت کرد تەرمـەکـەی بهێنێـتـەوەو، بەو پارەیە گۆرو گۆرخانەیەکی گەورەو شیاوی بایـرۆنـی شاعیـری رۆمـانـسی گەورەیـان پێ دروسـت کرد ونمـوونـەیە کیان لەو پەیکەرەی کە مادام تووسۆ لە ساڵی ١٨١٦دا بۆی دروست کردبـوو ، بۆیـان لە مۆم دارشـت و لە سەر گۆرەکـەیـان دامـەزرانـد و بەم جۆرە دوای سەدو شەش ساڵ رێزی شیاوی خۆی لێنرا.

سەرچاوەکان:
١) سمیر شیخانی ـ مع الخالدین ـ بیروت ١٩٥٩، ص ١٦٦، ١٦٧
٢) الموسـوعـه العـربیه المیسرة ـ القاهرة ١٩٧٢، ط٢، ص ٣٢٢

● کەریم مستەفا شارەزا ●



ناهیدە شێخ سەلام

# کوڕی بابە
# کچە کورد مان میوانە

بەمیوانی (کوری بابە ـ کچە کورد ـ ن. س) ڕەنگین گەشایەوە. بەوەی یەکەم ئافرەتی کوردی لەم بوارانەدا بەنێوەی خوێنەرانی ئەم گوڤارە ناساندو ئاشنای کردنەوە، (کچەکورد) یەکەم ئافرەتی کورد لەم بوارانە دا.

ـ لەنوسین لە لاپەڕەی گوڤاری گەلاوێژدا.

ـ لەچالاکی لەبزوتنەوەی ئافرەتان لەسی یەکان وچلەکان دا

ـ لەگەیشتنە پلەی ئەندامیتی لیژنەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان لە پەنجاکان دا

هەلێك بوو بومان ڕەخساو لەکیسمان نەدا، ئەو کەوتبوە پێ و شوێنی چاپکردنی دیوانەکەی خوالێ خۆشبوی باوکی. سی ساڵ پترە ئاشنایەتیم لەگەلدا هەیە، لەگەڵ دکتور (حەسەن جاف) پێکەوە هاتن ئێمەش بەرەسم و عادەتی خۆمان بەخێرهاتنمان لێ کردن و دەرگای ئەم وت و وێژەمان لەگەڵ (کچەکورد) دا کردەوە

ـ خانم با هەرلە منداڵیەوە سەرکەوین، لە سی یەکان دا لە سێبەری شێخ سەلامی باوکتاندا چیتان دێتەوە یاد؟

● ساڵی نوصەدو سی بوو (حەپسە خانی نەقیب) لەبزوتنەوەی ئافرەتان و سەرجەمی کوردەواریدا دەورێکی گرنگی ئەگێرا ئەوسا تەمەنم هەشت نو ساڵان بوو، ڕۆژی ۲۸ی تەمووزی ۱۹۳۰ لەسلێمانی کوبونەوەیەکی گەورە کرا وابزانم بو (زانستی) بوو، شان بەشان حەپسەخان لەناو ئافرەتان دا (بدریە شێخ قادرو شفیقە سعید) یش چالاك بوون، منیش لەناو ئەوجەشاماتە قوت بومەوەو گوێم ئەگرت و چەپلەم لێ ئەدا، ئەمە یەکەم هاندەرم بوو، ئیتر لە حەپسەخانەوە نزیك کەوتمەوە.

ـ (سی یەکان)تەواو، یان ماوتە بیلێیت؟!

● ماومە، صالح زەکی صاحبقەران لە(چەمچەماڵ) قایمقام بوو باوکم لەشەریکە کاری ئەکرد، باوکم کوری نەبوو، منی زور خوش ئەویست، لەوێ بو نەوروز ئاهەنگێکی گەورە سازکرا، فایق بێ کەسیش، شیعری تیدا خوێندەوە، ڕەحمەتی باوکم شتێکی بونوسیم و پێی وتم کوری بابە بچورە پێشەوەو ئەم نوسینە بخوێنەرەوە، منیش دەستم کردە خوێندنەوەی کە ئەڵێت (ئەی زەواتی محترم، هەمو ئەزانین کە نەوروز جەژنێکی میللی کوردە وەلێ لەبەر عەنعەنات میللی ئەوروژە ڕەخشانە خراونەتە تاریکستانی ئەسارەتەوە میللەتمان زیندوەو نامری)ئای بوویە چی چەپلە ڕیزانێ، وەك باڵندە بێ باڵ لەئاسمانی خەیالاتدا دەستم کردە فرین و ئەمە هاندەری دووەمم بوو.

ـ وابزانم بازدەینە چلەکان باشترە؟

● کاك نەریمان لێم گەرێ هێشتا ماومەو تەواو نەبوە، ئەوەبوو لەساڵی ۱۹۳٦چومە (دار المعلمات) لە بەغداد، لەو ماوەیە بو نەوروزێك گەرامەوە سلێمانی، میری دوایراوی ئەوسەردەمە مەنعی ئاهەنگی نەوروزی کرد، منیش هاتم کارتی جەژنە پیروزەم بەشیعر بو ئەم وئەو نوسی، تیادا نوسیبوم:

جەژنی نەوروزتان یاخوا پیروزبێ

هەوارتان بەرزو تیرەوبەهرووزبێ

پیرەمێردی نەمر

لەژێندا پەنجەی بو ئەم کردەوەیەم

راکێشاوە شێخ مەحمودی نەمریش لە ئاوارەیی یەوە ئەم وەلامەی بو ناردم کەتیادا ئەفەرموێ:

کاوەی کورد کوانێ ئەی بەرگوزیدە:

فەرەیدون حازر سلاح پوشیدە

ـ دەورتان لە نوسین لەگوڤاری گەلاوێژ چون بوو؟

● هەرکە تیشکی گوڤاری گەلاوێژ لەکەل دەرچو، سەرەتای ماموستاییم بوو، چەند ژمارەیەکم لێ ئەکری بەناو لاوان و ئافرەتان دا دابەشم ئەکردن، خوێشم دەستم دایە نووسین و شیعرو بابەتی ئافرەتان و کومەلایەتیم تیادا ئەنوسسی بەناونیشانی (کچە کورد ـ ن. س) باوەرکە هیچیانم لەبەر نەماوە مەگەر خوت کەلە بیلیوگرافیا پسپوری بیان دوزیتەوە.

ـ لە نوسینەکانی (کچەکورد)، ئەمانەن:

دلسـوزی ڕاستی ژماره (٦)ی سالّی ١٩٤٤ چیـروکی ژمـاره دەی سالّی ١٩٤٤ (ئیش وئازاری )
دایکیتی ژماره (٦ )ی سالّی ١٩٤٥ بەرەیـی هەژار بە هەژار ژمـاره (١٢)ی سالّی ١٩٤٤لـەگـوڤـاری شەفـەقیشـدا ناهیـدەخـان چەنـد نوسینیکی بلاوکـردوەتـەوه یەکیکیان پارچە شیعریکە بە ناونیشانی (وەره بابـروین ـ دایکی ڕوژ) ژمـاره دەی نیسان ١٩٥٨

ـ ناهـدەخـان وەیـان (دایکی ڕوژ) بوچی لەشـەستـەکـانـەوه هیـچ نوسینیکتان بەرچاو ناکەوی ؟!

● برا ، ئافرەت کە مندالّی زوربوو ئەرکی بەخیـوکـردنی مالّ و مندالّ و میـوانی کەوتـە ئەستو قەلەم لەدەستی لار ئەبیتـەوه، منیش هەشت مندالّم بەخیـو کردوەو ئیستـا هەمـوویـان گەورەبوون . ئەگینا لەخویندنەوه دوا نەکەوتوم وائەبینیت دیوانی شیخ سەلامی باوکم ئامـادەکـردو دامـە دەزگـاکـەی ئیـوه (بـەسـاقـەتابـم چاوتـان لی بیت ) شیخ باوکی کورد بوه نەك تەنها باوکی ناهدە .

ـ قسـەی خومـان بیت گوڤـاری (ڕەنگین)ئـەخـوینـنەوه چونتان دیتەبەرچاو؟

●ڕەنگین ڕەنگـدانـەوەی سروشـتـه ڕەنگینـەکـەی کوردسـتـانه نەك تەنها بەدلّـی منـەو بەس بەلّـکـو بەدلّـی جەماوەری کوردستانە، هەربژین و پایەداربن) باخومانیش ئەوه بلّیین ، کە ناهـدە خانمی کچی شیخ سەلام : سالّی ١٩٢٢ لەسلیمـانی لەدایك بوه، سالّـی ١٩٤٠ لەدارالـمعلمین دەرچوەو یەك سالّ ماموستایی کردوه ئەودوایـی بەریـوه بەر بوه، سالّـی ١٩٦٧ خانـەنـشیـن بوەو ئیستـا نیشتەجی ی سلیمانی یە .

● مصطفی نەریمان: ●



# ئوتۆمۆبیلەکەی «سەعدیە»خان!

لەوانـەیـە زور ڕونـاکبیـرانی کورد ناوی[أنیس منصـور]یان بیستبی و بەرهـەمیان خویندبیتەوه . یەکیکە لە ڕوژنـامـە نووسـە میسـری یـە بەنیـو بانگـەکـان ، سەرەڕای ئەوەی کە جوره تام وچیـژیکی تایبـەتی لە شیوازی نووسینەکانیا هەیە .
لە یاداشتی ڕوژنـامـە نوسی ئەم نووسـەرەدا ئەوەمان بو دەر دەکەوی کە لە تەك نیوه بە لە زەتـەکـەی تری کومـەلّ دا دانـوویان پیکەوه ناکولّی تەنانەت خوی دان بەوەدا دەنی دەلّی : لە هەرزە کاریمـا ئەو وشـانـەم کو دەکردەوه کە دژ بە ئافرەت وتراون» .
چەنـدین ڕستـەیشوبنهاوەر و عقادی لەو بارەیـەوه لە دەفتـەرەکـانیـا وەك سەرمەشق نووسیوەتەوه .
لە بەشیکی ئەو یاداشتـەی لە ژمـاره (٢٧٠٣)ی گوڤـاری (اخر ساعه)دا دەلّی : «کـاتی کە هیشتـا قوتـابی زانکـو بووم ، یەکی لەو کچـولّانەی لە پو لەکـەی من دا بوو ئوتـومـوبیلیکی خنجیلانەی هەبوو، هەرچـەندە زور سەرو ساخیتشمان نەبـوو، بەلّام ڕوژیکیـان بە لوتفی خوی فەرمـووی لی کردم کە بمگـەیـەنیتـە ئەو شوینـەی بوی دەچم ، سەرەتـا حەپـەسـام بەرامبەر بەو هەمـوو جوانـی یـەی خوا پیـی بەخشیبوو، ئەی نازداری یـەکەی، چست و وچـالاکی یـەکـەی، بونی عەتـری خوی و بریـقـەی ئوتـومـوبیلەکـەی . نـاوی خوام لی هینـاوچوومـە تەنیشتیـەوه وتی : با جاری بچینـە دایەرە لای خوم سەرو
کاتـەدا لە کولیـژی حقـوق لە تەك ئیمـەدا قوتابی یە، لە هەمان کات دا لە وەزارەتی دەرەوەش دا فەرمانبەرە .
لە دلّـی خوم دا وتـم : باشـە چون هیشتـا زانکـوی تەواو نەکردووه ئەم وەزیفـە باشـەی پچربوه؟ ئاخو چی بی لە وەزارەت؟ ئەی ئەم ئوتـومـوبیلە چون؟! ئەی ئەو هەمـوو زیـرەی پەنجەکانی وگویچکەی وگەردنی و سینەی؟
لیی پرسیم : جگـەرە دەکیشی؟ ئەم جارەیان بە جاری واقم وڕما، چون دەبی جگـەرە بکیشـم و هیشتـا قوتـابیم! پرسی : خوییت ناخـوش نی یـە من جگـەرەیـەك داگیرسینم .
ئەوی ڕاستی بی چونکـە فیـری ئەو جوره پرسیـارانـە نەبووبووم وەلّامم نەدایـەوه، خوا هەلّنـاگـری ئەویش دای نەگیـرسـانـد . پرسی : چی ئەکەی و بە چی یەوه خەریکی؟ چاوم بری یـە نووکـی پیـلاوه نا موبـارەکـەکانم کە هاتو چوی نیوان (ئـەمبـابـە)و زانکـو لە کەلّکیـان خستبـوو . لەو کاتـەدا ئارەزووی ئەوەم دەکـرد سەری پەنجـەکـانی قاچم بخـورینم ، یان هیـچ نەبی سەرم بخـوریـنـم . بـاش بوو ئارەزووەکـەمی پی بریـم و وتـی : ئەگـەر مامم نەبوایـە ئەم وەزیفەیەم دەست نەدەکەوت . مامیم نەدەناسی ، تـەنانەت ناوی تەواوی خوشیم لە بیـر چوو بووەوه . هەر ئەوەنـدەم دەزانی ناوی (سـەعـدیـه) یە پیست پەمـەیی قژ زیـرین ، چاو هەنگوینی

**فنجـان قاوه بخـوینـەوه زانیم کە لەو هەمـوو گیـانی موسیقـایـە کە پی**

دەکـەنی گشـت ئەنـدامـی لەشی **دەکـەم:** جولّانـە ئەگەر پی نەکەنی هەرچەندە من هەرگیز ئەم دیوو بی دەمی پر لە پیکـەنین ، تـو بلّی ئەگـەر زور قاقـای لی نەدا وا لەشی هەر دەکـەویتـە لەنجەو لار وەك خوا ئەوی کردبی بە نوینـەری ئیمـە ، بەشی هەمـوو ئازار دراوان دلّ پر لە خەمـەکـانیش پی بکـەنی لە ناکاودا هیمـای بو پەنجـەی دەستی چەپی کردو وتـی : ئیستـا ئازادم شکـور ڕزگارم بوو .
بەمـانـا میردی هەبووه ئیستا تەلّاقی لی سەنـدووه یان تەلّاق دراوه کە گەیشتینـە ژوورەکەی بوی گیرامەوه کە هاوڕییـەکـی زانـکـو بوی گیـراوەتـەوه کە میـردەکـەی لە تەك کچیك دا پەیوەندی هەیە ئەمیش کە لە باخـچـەی ژاپـونـی لە (حلوان)پیکـەوه دیبونی ئیتر بە دیار میـردەکـەیـەوه دا نەنیشتووه . منیش هەر لە خومـەوەبی ئەوەی هیچ بزانم قسەیێکم فڕی دا ، وتم :
ـ جا ئەم شتـەت بو وا گەیاندەتەلّاق ، خو توش پەیـوەندیت لە گەلّ یەکیکی تردا هەبوو .
فلّانـی هەر ئەوەم وت ئیتـر خوی بەردا بی حساب مەسەلەکەی یەکالّا کردەوه ، جاری لە پیشا وتی : ئەزانم ئەوه خوی پیی وتوی بە لای خویەوه هەزار سوینـدی بو خواردووم کە ئەمە هەر لە نیوان خومان دا دەبی .
ئەوی ڕاستی بی من بەو پەیـوەندیەم نەدەزانـی ، بەلّام پیشم ناخـوش نەبوو کە بەو دەنگە ناسکەو بەو زمانە شیـریـنـە و بەو نازو نووزەوه دەیگیـرایـەوه . . دانی بە شتی وادا دەنا کە بە خەویش ئەم دەبینی .

● مستەفا سالّح کەریم ●

# چاوی پشتە سەری جەماوەر

• رۆژنامە نووس •

دوای راسپاردەکەی دیوانی سەرۆکایەتی بەعەجبوورکردنی هەموو وەزارەت و دام ودەزگاکانی دەولـەت کە وەلامی هەموو ئەو شکات و داخوزیانە بدەنەوە کە لەرۆژنامەو گۆڤارەکان دا بلاوئەکرێنەوە. ئیمە لەنێوان کارروباری رۆژانەی رۆژنامەنووسیمانەوە هەستمان بەسێ جورە هەلوێست کرد.

هەلـوێستی یەکەمیان، بەدەنگەوەهاتنی هەندێ لەودام و دەزگاو دایەرانەی کە داخوازیو راسپاردەو گیروگرفتی هاولاتیانمان ئاراسـتە کردوون. بیان بەوەلام دانەوەی ئیمە یاخود چارەسەری مەسەلە باس کراوەکە.

هەلـوێستی دووەمیان، بێ دەنگ بوون و خولی کەرکردنی هەندێکی تر لەم دام ودەزگاو دایەرانەی کە گیروگرفتی هاولاتیانمان ئاراستە کردوون، بەشیوەیەك کە ئەلێی هەر هیچیان نەبیستووەو میشێك میوانیان نی یە.

هەلوێستی سێیەم، توورەبوون و زویربوون ولوتەلایی هەندێکی تریان، کە بە ناحەق رووی خویان لە ئاستی داوای هاولاتیان گرژ کردووە یاخود سەیرسەیروبێ واتاو راستی بو کەم و کوڕییەکانیان ئەدەنەوە کە بە هیچ جورێك خزمەتی رێرەوی لەبروی شورش و سەرکردایەتی و راسپاردەکانی سەرۆکی تێکوشەرمان سەرۆك صدام حسین و بەرژەوەندی کومەلانی خەلك ناکات.

بەلێ هەلـوێستی دووەم و سێیەم ترسناکن و رێگا لە کاروباری راستەقینەی رۆژنامەنووسی ئەگرن و دەوری پیرۆزی (خاوەن شکوی) وەك رۆژنامەنووسی دووا ئەخەن، جا ئەگەر وابێ ئەوالێتر رەنگە رۆژنامەنووسی بێ سەبرو کەم تحمل هەبێ پشتی مارد ببیشەوەو بلێ ئیتر بو خوم هیلاك بکەم، بو بەدووای هیلاك بوون دا بگەرێم. ئەمەش هەمدیسان هەر زەرەروولە جەماوەری رۆژنامەنووسانودنیای رۆژنامەنووسی ئەکەوێت، لەحالێکدا کە ئەبێ بەهور شێوەیەك پشتی پیشەی پیروزی خوهیلاك کردن بگیری و دەوری لەبنیاتنانی کومەل دا زیاتر بکرێت، کە لەم رووەوە سەرۆکی گەورەمان سەرۆك صدام حسین ئەفەرموێ (رۆژنامەنووس مروڤیکی سەکردەیە لە کومەل دا)

لەبەرانبەری ئەمانە شەوە چەندە دلخوش و خوش بەخت ئەبین کە ئەبینین لایەنێکی رەسمی بەدلێکی فراونەوە بەدەنگمانەوە دێت و وەك ئەرکی سەرشانی خوی گیروگرفتەکانیش چارەسەر ئەکات و وەلامی ئیمەش ئەداتەوە، وەك دایەرەی تەندروستی سلێمانی کەتاکو ئیستا لەم گوشەیەوە هەرچیمان ئاراستەکردبێ، خێرا بەنووسراوی رەسمی ئاگاداریان کردووین کە چیان کردووەو چیان بریارداوە ئیمە گەلێ مەمنونی ئەو دایەرەیەو بەرێز دکتور لطیف أمین بەرێوەبەری گشتی ئەو دایەرەیەین داوا کارین ئەمونەیان زوربێ و خەلکی تریش چاو لەوانبکات. بو نموونە شارەوانی سلێمانی لە ئاستی داخوازییەکانی خەلکی شاری سلێمانیدا (کەرەی شەرپەتێ)لەیەکەم ژمارەی ئەم گوشەیەوە گەلێ مەسەلەمان خستە بەردەستیان کەچی ئەوان گوێ نادەنێ رەنگە تیا یانا ئەبێ رەنگین بخوێنێتەوە، ئەگینا بو..؟ تەنها پرسیارێکەو هیچی تر..!!

## ● گوندی کوڕیو تەلەفون ●

● کاك هاوڕێ بێچارە خەلکی گوندی کوڕێ نامەیەکی بو رەنگین ناردووەو سکالای خوی و خەلکی دێی کوڕێی تیا باس کردووەو ئەلێ.

- دانیشتوانی دێی کوڕێ ناحیەی صلاح الدین کە ئەکەوێتە نێوان شاری مەسیف و شەقلاوەوە چەند هەزارمالێك ئەبن. ئەم دێیە وەك شاروچکەیەکی لێهاتووەو پێویستی بەخزمەت گوزاریی و مەسەلەی شارەوانی هەیە. لە هەموو زەروروریتر مەسەلەی تەلەفونە کە زور پێویستمان پێیەتی و داوا ئەکەین چارەیەکمان بکەن.

● ئیمەش ئەم داوایە ئەخەینە بەردەست و چاوی کاربەدەستان لە پارێزگاو دایەرەی تەلەفوناتی هەولێر و چاوەروانین.

# وەلامی پوستەی خەلیفان

● کاتی خوی لە گوشەی ژمارە (٢١)ی رەنگین دا نامەیەکی هاولاتی کاك صالح بلە یمان بلاوکردەوە کە گلەیی لە دایەرەی پوستەی خەلیفان کردبوو، والێرەدا بەسوپاسەوە بو پوستەی خەلیفان دەقی وەلامی کاك مام پیر حمد مام پیر لێ پرسراوی پوستەی خەلیفان بلاوئەکەینەوە کە بەنووسراویان ژمارە (١٤٢)لە ١٣/٩/١٩٨٩ناردبوویان.

+ بو گوڤاری رەنگینی بەرێز، سلاوو رێزمان بو دەستەی کارگێرانی گوڤارەکەتان:-

لە ژمارە(٢١)ی گوڤارەکەتان دا بە ناونیشانی (پوستەی خەلیفان نامەکانیان ناگەیەنن)نامەی هاولاتی صالح بلەییتان بلاوکردبووەوە ئیمە وپەری شانازییەوە سوپاسی گوڤارکەتان وکاك صالح بلەیی ئەکەین وئەمانەوێ لەو رووەوە چەند خالێکتان بو روون بکەینەوە ئەمانەن.

١- ئەگەر هاولاتی کاك صالح بلەیی بەلگەیەکی راستەقینەی لەو رووەوە بەدەستەوە هەیە، با سەر لە دایەرەی پوستەی خەلیفان بدات بو ئەوەی لێپرسراوی ئەو مەسەلەیە سزابدرێت.

٢- تاکو ئیستا نە ئەم هاولاتیەو نە یەکێکی تر بەهیچ جورێك دەربارەی ئەم کەم تەرخەمیانە ئیمەیان ئاگادار نەکردووە.

٣- ئەتوانین بڵێین کە مەسەلەی نامە ناردن و پۆستە ناردن زۆر بە ڕێك وپێکی لەنێوان خەلیفان و قەزای صدیق دا بەڕێ ئەکرێت و ئێتر داوای بەختەوەری و سەرکەوتنتان بۆ ئەکەین بۆ زیاتر خزمەت کردنی هاوڵاتیان لە سایەی سەرکردایەتی ڕۆڵەی تێکۆشەر و پاڵەوانی ئاشتی و سەرکەوتن سەرۆك صدام حسین (خوا بیپارێزێ) ئێتر سوپاس.

مام پیرحمد مام پیر
لێ پرسراوی پۆستەو تەلە فۆناتی خەلیفان.

## پرسیارێك لە کارەبای سلێمانی

●لەم ماوەیەی دوواییدا گەلێ نامەی هاوڵاتیانی خەڵکی کۆمەڵگای پیرەمەگرونمان پێ گەیشت کە هەموویان باسی یەك مەسەلە ئەکەن، ئەویش پرسیارێکەو وا لێرەدا ئێمە ئاراستەی کارەبای سلێمانی و کارەبای لادێکانی سلێمانی ئەکەین و چاوەڕوانی وەلامین.

● کاك ئاوات هەڵگوردو کاك ئومێد محمد ڕەسوڵ و کاك عبدالقادر أمین و ڕەسوڵ حمە ڕەسوڵ نامەیان بۆ ناردووین. تەنانەت کاك ڕەسول حمە ڕەسوڵ دوونامەی دووروودرێژی بۆ ناردووین، ئەم برادەرانە هەموویان باسی ئەوە ئەکەن کە:-

ڕاکێشانی کارەبا بۆ گەڕەك و ماڵەکانی کۆمەڵگای پیرەمەگرون بە گوێرەی سەرەو حەق نی یە..!! بەڵکو بەواسطەو بەرتیل و دەوڵەمەندی و خۆخۆییە.. فەقیرو هەژاری ئەم کۆمەڵگایە ناتوانن بەحەقی خۆیان وسەرەی خۆیان کارەبا وەربگرن، چونکە خاوەن دەسەڵاتەکان هەمیشەلە پێشەوەن...!

● ئێمەش ئەم مەسەلەیە ئەخەینە بەر دەستی کاربەدەستانی کارەبای لادێکان و کارەبای سلێمانی و تەنها یەك پرسیاریان لێ ئەکەین و ئەڵێین:

● ئایا ئەگەر خۆتان سەرتان دا لەم کۆمەڵگایەداو بەچاوی خۆتان ئەم فەرق و فروق و واسطەکاری و نارە وایەتان بینی چی ئەکەن..؟!
چاوەڕوانی وەلامین..!!

## نفوسی سلێمانی گوێ لەم سەرگورشتەیە بگرن..!!

● کاك أبوبکر معروف لە سلێمانیەوە نامەیەکی دووروو درێژی بۆ نووسیوین و تیایدا سەرگورشتەیەکی سەیرمان بۆ ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ ١- ئەم سەرگورشتەیە بەگوێی دائیرەی نفوسی سلێمانیدا بدەن بزانن وەلامیان چی ئەبێ. وائێمەش دەقی سەرگورشتە کە ئاراستەی دائیرەی ناوبراو ئەکەین و وچاوەڕوانی ئەنجامین.

+ لەشەوی لەدایك بوونی سەرۆکی قاوەمان سەرۆك صدام حسین دا (خوا بیپارێزێ) خوا کوڕێکی داینی، چونکە لەو شەوە پیرۆزەدا لەدایك بووبوو، هەر لە خەستەخانە ناومان نا (چاوان) و ئێتر لە خەستەخانەی تەعلیمی سلێمانی بڕوانامەی لەدایك بوونم بۆ دەرهێناو بردم بۆ دایەرەی نفوسی سلێمانی، پاش ماوەیەك چوومەوە بۆ هەویەکەی وتیان ببورە لەنێوان ژووری (م ٦) و ژوری کەبس دا وون بووە، ماوەیەکی تر سەرمان لێبدەرەوە بەشکم بۆت بدۆزینەوە، منیش سێ و چوار جاری تریش چووم هەرنەبوو، تاکو بۆم دەرکەوت کە ناخۆشی لە نێوان فەرمانبەرەکانی ئەو دوو ژوورەدا هەیەو، هەر ئەو ناکۆکیەش بوەتە هۆی ون بوونی گەلێ هەویەی تری هاوڵاتیانی فەقیر وهەژار،
لە دووایدا پێیان وتم بچۆ پولێکی پێنج دیناری بهێنە با (بدل ضائع)ت بۆ دەربهێنین. ئایا من و هەر هاوڵاتیە کی تر گوناهمان چی یە، بەهۆی ناکۆکی فەرمانبەرە کانی نفوسەوە لە هەویەی ئەدیو. جەزاش بدەین و هاتوو چۆکەش بابوەستێ...!!

● ئێمەش بەدائیرەی نفوسی سلێمانی ئەڵێین ئێوەڕاتان چی یە..؟!

## لە کۆمەڵی هەرەوەزیی ئیستیهلاکی سلێمانی و سوق المرکزیدا بانیکەو دوو هەوا

● کاك محمد روستم احمد، لە سلێمانیەوە نامەیەکی بۆ ناردووین باسی ئەوە ئەکات کە لە نێوان ئیشوکاری کۆمەڵی هەرەوەزیی ئیستیهلاکی سلێمانی و سوق المرکزیدا بانیکەو دوو هەوا، وا لێرەدا دەقی ئەو نامەیە ئەخەینە بەر دەستی سەرۆك و ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵەو چاوەڕوانی وەلامیان ئەکەین.
کاك محمد لە نامەکەیدا ئەڵێ:-

* وەك ئەزانن کۆمەڵی هەرەوەزیی ئیستیهلاکی و سوق المرکزی یەك ئامانج و یەك ئیش و کاریان هەیە، ئەویش دەستەبەرکردنی کەل وپەل و پێویستی ئەندامەکانی و هاوڵاتیانە، بەڵام لە نێوان ئیشی کۆمەڵی هەرەوەزیی سلێمانی و سوق المرکزیدا جیاوازییەکی زۆر هەیە، بۆ نموونە لە سوق المرکزی هەموو شت هەیە. دۆشاوی تەماتە، سەلاجە، مجمدة، مبردة، پانکەو گەلێ شتی تریش، کەچی لە کۆمەڵ دا تەماتە هەموویان دوو سێ ساڵە کەس بە خزمەتیان نەگەیشتووە، من بەش بە حاڵی خۆم دوو ساڵە پارەم خەواندووە بۆ زۆپیا کەچی هیچ هەواڵێکی نی یەو لەم بەینەش دا لێپرسراوانی کۆمەڵ وتیان وەرن پارەکەتان وەربگرنەوە، چونکە هیچمان نی یە..!!
ئێستر نازانین ئەو کەل و پەلەی وەری ئەگرن بۆ کوێ ئەچێ و چی لێ دێ..؟ ڕاستە هەندێکی بەواسطە دابەش ئەکرێ، بەڵام ئەی ئەوەلای چی لێ دێت...؟ بۆ لە سوق المرکزی هەمووشت هەیەو سەرەی بۆ ئەنووسرێ و هەرکەس بەختی هەبێ بۆی دەرئەچێت..! ئەبێ بانیکەو دوو هەوا..!!

# ئەدەبی کوردی لە دەرەوە

ÇAĞDAŞ KÜRT EDEBIYATINDAN
Öykü Yazarı, Çevirmen AHMET MOHAMMED İSMAİL
İLE KISA SÖYLEŞİ

**U YAŞAR IŞIKHAN**



**Sayın A Mohammed İsmail bize kendinizi tanıtır mısınız?**

1943 yılında Kerkük'un bir köyünde doğdum. Uzun süre ilkokul öğretmenliği yaptım. Emekli oldum. Sanatsal yaşamım genç yaşta başladı. Genellikle öykü yazıyorum. Çevirilerim de oldu. Özellikle oyun çevirdim. Bütün oyunlarım sahnelendi. Şimdiye kadar beş öykü kitabım yayımlandı: ''Önumdeki Ağaç'', 1968, ''At'' 1973, ''Bekleyiş'' 1980, ''Sabırtaşı'' 1986 ve son yapıtım ''Yurekten bir soluk'' 1971'de Kürtçe olarak yayımlandı. Nazım Hikmet'ten beş oyun, Necati Cumalı ve Yaşar Kemal'den de birer öykuyu Kurtçeye çevirdim. Şimdilik ''Bayan'' ''Rengin'' dergilerinde ve ''Hevkâri'' gazetelerinde (Kurtçe yayın organlarında) öyku yazarak ve köşe yazarlığı yaparak yaşamımı surdüruyorum.

**Sayın Mohammed İsmail, Irak Kurt edebiyatından söz eder misiniz?**

Her ulkede olduğu gibi, Irak Kürtleri arasında da iyi şairler ve yazarlar vardır. Fakat şair ve yazarlarımızın urunleri başka dillere çevrilmediği için pek bilinmezler. Bizler çağdaş batı edebiyatını çok iyi biliyoruz. Gelecek açısından Kurt edebiyatının hakettiği yere geleceğine inanıyorum. Bizim de gelişmiş ulkelerden farkımız yok. Edebiyatımız var, sanatımız var. Teknik olarak da kuramsal olarak da çok iyi bir duzeydeyiz. Irak Kurt edebiyatında çok iyi şairler yetişmiştir. Örnek olarak Piremel, Gören, Şeyh Nuri gibi. Bütun bunları söylerken komşu kulturlerden de yararlanıyoruz. Türk edebiyatını çok iyi biliyoruz. Nazım Hikmet, Yaşar Kemal, Hasan Huseyin, Necati Cumalı ve Aziz Nesin'i bizde bilmeyen yok. Çevirisini yaptımız her yapıt ortalama olarak otuzbin basılmakta ve kısa surede tükenmektedir. Aynı şekilde Turk Edebiyatçıları ve okuyucuları Kurt edebiyatını tanıdıkça birbirimizi daha iyi anlayacağımıza inanıyorum. Sizin kulturunuzu ve sanatınızı oluşturan mozaik yapılanma bizler için de geçerlidir. Irak'ta kultur ve sanata verilen önem bizim birbirimizi tanımamıza ve dostluk içinde yetişecek genç kuşağın kaynaşmasını daha da hızlandırabilir. Bu arada karşılıklı olarak çeviriler yaparak, kültür ve sanatımızı daha geniş bir yelpazede paylaşabiliriz.

**Sayın A Mohammed İsmail, ülkenizde bu 9. kez tekrarlanan Mihrican el Mirbed Şiir Festivali'ni nasıl değerlendiriyorsunuz?**

Mirbed Şiir Festivali'ni çok yararlı görüyorum. Dünya şairleriyle tanışmak her anlamda geliştiricidir. Bu tur festivallerin çoğalması, Dunya barışına da önderlik yapar, zemin hazırlar. Çunkü biz yazarlar hep insanı, barışı ve kardeşliği savunuyoruz. evrensel elçiler olarak, geleceğin güzel ve mutlu barış ve kardeşlik duyguları bizlerin sırtında yukselecektir. Bu yuzden burada başlatılmış olan dostluk iki ulkenin Irak ve Turkİye sanatçılarının daha çok birbirlerini tanımalarını sağlayacaktır.





لەم ساڵانەی دوایی‌یەدا ئەدەبی کوردی چ لە لایەن ئەدیب و نووسەرە کوردەکانەوە بێ، چ لە لایەن غەیرە کورد، هەنگاوی وەرگێرانی نموونەی ئەدەبی کوردی بۆ زمانی تر نراوە. ئەمەش هەنگاوێکی بە سوودە بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردی بە بیانی.

جگە لەو نموونانە ی کە رۆژنامەی عیراق دەیکا بە عەرەبی، رۆژنامە عەرەبی‌یەکانیش چەند نموونەیەکی ئەدەبی کوردی‌یان کردووە بە عەرەبی. لە یەکێ لە رۆژنامەکانی سعوودی‌یەدا چاوپێکەوتنێکی تێر و تەسەل دەربارەی ئەدەبی کوردی لە گەڵ د. نافع ئاکرەیی‌دا کراوە، هەر لە هەمان ژمارەی ئەو رۆژنامە سعوودی‌یەدا سێ چیرۆکی کورتی چیرۆک نووس احمد محمد اسماعیل کراون بە عەرەبی، هەروەها لە مەغریبیش دا چەند چیرۆکێکی کراون بە عەرەبی.

ئەوەی ئێمە بزانین لە گۆڤارێک کە لە سوید دەردەچێ لە هەموو ژمارەیەکی‌دا نموونەی شیعر و چیرۆکی کوردی دەکرێن بە زمانی سویدی.

لەوانە، چیرۆکی مەم و محمد فریق و رؤوف بێ گەردو کاك أحمد.

لە ژمارەیەکی (حوزیران ـ تموز)ی ساڵی ١٩٨٩دا گۆڤاری (هۆمیرۆس) کە لە تورکیا دەردەچی لە گەڵ نموونەی ئەدەبی جیهانی‌دا دوو چیرۆکی احمد محمد اسماعیل بە ناونیشانی، لە ئەدەبی کوردی هاوچەرخەوە کراون بە زمانی تورکی و بلاو کراونەتەوە.

ئەم هەواڵانە سەرنج رادەکێشن و حەز دەکەین ئەدەبی کوردی بکرێن بە زمانی تر و لە رێگای ئەدەبەکەمانەوە میللەتەکەمان بناسن.

● ئازاد شوان ●

# لەتۆیشە بەرەی ژیانەوە

وتاریکی فرەمان لەسەر زانیاری گشتیو نوکتەو قسەی نەستەق و وتەی بەجێو پەندی پێشینان بۆ ئەم گۆشەیە بۆ هاتووە ، بە داخەوە بەشی زۆریان یان بە کەڵکی بڵاوکردنەوە نایەن ، یان خەتەکەیان ناخۆشەو بۆمان ناخوێنرێتەوە، یان مادەکەی زۆرەو لەم گۆشەیەدا جێی نابێتەوە. لەبەرئەوە تکا لە برایان و دۆستانی ئەم گۆشەیە دەکەین پەیرەوی ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن :

١ـ لەسەر ڕیەك دیوی کاغەزەکە بنووسەو، خەتەکەت خۆش و وەهابێت بخوێنرێتەوە

٢ـ بابەتەکە بەجیا بنووسە، واتە مەیخەرە نێو ئەو نووسراوەی کەخۆت دەی نووسی بۆ گۆشەکە، یان بوگوڤاری ڕەنگین.

٣ـ هەتا دەتوانیت وتارەکەت کورت و پوخت و بڵاونەکراوە بێت. ڕێنووسەکەت بەپێی ڕێنووسی کۆڕی زانیاری بێت.

٤ ـ ئەو وتارانەی بۆمان دێت ، پەسەند بێت، درەنگ، یان زوو بڵاو دەکرێتەوە، پێویست ناکا دووسێ جار هەمان وتارمان بۆ بنێری ئەو!لە گۆشەی ئەم جارەمان دا ، بەشی زانیاریتان پێشکەش دەکەین :

## ساندویج

● کاك عەلی ئەحمەد لە سلێمانییەوە، واتای (ساندویج)ی بۆ ڕوون کردوینەوەو بۆی ناردوین و دەڵێ :

لورد سانوویتش . . زۆر قومارچی بوو، تا ڕادەیێك فریای نان خواردن نەدەکەوت لەبەر ئەوە ، هەر کە برسی دەبوو، گورج «بابۆڵەیێك» نان و گۆشت ، یان نان و هێلکەیان بۆ دەهێنا. هەر لەسەر قومارەکە دەیخوارد ، بەم جۆرە (بابۆڵە)خواردن ناونرا

«ساندویتش»یان «سەندویج»لە ئەنجام دا وای لێهات کە دووکانی سەندویج بکرێتەوە. . بەم جۆرە لە زۆر شوێن دا، ئەم جەشنە خواردنە «ئامادەکراوە»ناونراوەساندویج . . .

* * *

## لوقمان حەکیم

●کاك بیمار ڕۆژبەیانی لە کەرکوك ـ گەرەکی شۆرجە، دەڵێت لوقمانی حەکیم بە کورەکەی دەبێژێ، ئەم وەسێتانەم لەیاد نەکەی :

١ـ ئەگەر لە نێوان خەڵکیدا بووی، زمانت بپارێزە.

٢ـ ئەگەر لەناو خۆشیدا بووی، ڕەوشتت بپارێزە.

٣ـ ئەگەر لە ماڵی یەکێکیتر بووی چاوت بپارێزە.

٤ ـ دوو شت هەرگیز لەبیر مەکە : یەزدان ـ مردن.

٥ـ دوو شت لە بیرکە : چاکەت لە ئاستی یەکێکیتر، خراپەی یەکێکیتر لە ئاستی تۆ.

## مرۆڤەکی فەقیر

●کاك قادر عەرەب هەرکی ـ کەلەکین کلو ـ ناحیا حریری ـ ئەم سەرگروشتەیەی بۆ ڤرێ کردووین :

مرۆڤەکێ فەقیر هەبو بخۆ ل کاسبی یێ دگەڕیا ڕۆژەکێ ڕابێ هەسپێ خو ل ئاشی بکەت چۆ هەتا گەهشتە سەر ئاشی ئەوو ئاشەوان پێك ناهێن قسەك ل وی قسەك ل وی هەر دوو بشەڕ تێن هەردوو ئێك دی تین و دبەن کەس نەشیا کەسێ ل عەردی بدەت : ئاشەوانی گوتێ ئەرێ تو نا ڕاوەستی ئەڤ مرۆڤی گوتی ب خودێ هەکە تو ڕاوەستی ئەز هەرێ ڕاوەستامە : هەردوو لێك گەڕیان

* کاك عبدلسلام عبدالعزیز قادر لە هەولێرەوە ، ئەم وتارەی دەربارەی هەنگ دوزینە بۆ ناردوین :

## هەنگ دۆزینەوە

هەنگ دۆزەکان لە لادێکانی کوردستان بەدوای پەیداکردنی هەنگوین دەکەون کاتێ کە هەنگ لەسەر کانیاوەکان و جوگەلەکان ئاو دەخواتەوە. کە ئاوی خواردەوە ئەگەر ٣ـ ٤ سوڕی خوارد بە دەوری خۆیو بەرز فڕی دیارە شوێنەکەی زۆر دوورە. بەڵام هیچ سوڕی نەخواردو نزم فڕی شوێنەکەی نزیکە جا هەنگ دۆزکان بەشوێنی دەکەون. بەم جۆرە دەست نیشانی پورەهەنگ دەکەن. هەندێ لە هەنگ دۆزەکان بە شوێنی میزی هەنگ بەپورە هەنگ دەکەون، هەنگ ڕووەو خۆرهەڵات میز دەکا لەسەر بەردەکان ڕەنگی قاوەیی جێدەهێڵی وە بۆ هەنگ دۆزەکان دەرکەوتووە کە شوێنی میزکردن تەنها 250 مەتر لە پورەی هەنگ دوورە. لە چیاکان هەنگ پورەکەی لە د.رز ی شاخ وەیان لە کونە شاخ، یان لە قەڵشی پیرەدارەکان وە هەنگوینی پورەکانی زۆر بە زەحمەت دەرئەکرێ بەڵام دارەکان زۆر بە ئاسانی دەرئەکرێ . پورەی دارەکان پاش هەنگوین دەرهێنان لێی پورەکە وەك خۆیدێڵنەوە یان دارەکە دەبرن و پێی دەڵێن (کوڵ) جادەمی کوڵەکە دەگرن و دەی هێننەوە ماڵەوە بۆ ئەوەی بەخێوی بکەن لە ماڵەوە. ئەمە چۆنیەتی هەنگ دۆزینەوەیە لە کوردستان.

## جوانی ئافرەت

* خوشکە ناسکە محمد ڕوؤف و کاك عثمان جاف لە سلیمانییەوە ئەم وتارەیان هەریەکە بەجیا دەربارەی جوانی ئافرەت بۆ ناردووین ، هەردووکیان لە کتێبی «ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا»ی خوالێ خۆش بوو مامۆستا بەشیر موشیر ـ وەك خوشکە ناسك دەڵی ـ وەریان گرتووە :

١ـ جوانی سێ شتە : ڕەوشتی باش، دەم بەخەندە، خاوەن ناموس.

٢ـ سپیتی سێ شتە : پێست، ددان ، دەست،

٣ـسووری سێ شتە : لێو ، کولم ، نینۆك،

٤ـ ڕەشی سێ شتە : چاو ،برۆ، برژانگ

٥ـ درێژی سێ شتە : باڵا ،باسك ، گەردن

٦ـ کورتی سێ شتە : گوێچکە. ددان، پێ

٧ـ پانی سێ شتە : سنگ ،ناوچەوان ،بەینی برۆ

٨ـ پڕی سێ شتە : پشتی پێ. دەست ،برۆ

٩ـ باریکی سێ شتە : ناوقەد. قولەپێ، لێو

١٠ـ نەرمی سێ شتە : پەنجە. سمت، قژ.



# راوێژکاری نوژداری

د. نافع ئاکرەیی

※ کاك عبدالحمید طەقاسم لە ڕەحیماوای کەرکوك : کاکە گیان ئەوەی راستەو زانست سەلماندویەتی هەر لە یەکەم جار کە منال لە دایبك بووەو چاوی بە ڕووناکی دونیا کل داوە ویەکەم هاواری کردوتە دیاری بو هاتنە ناو ژیان هەر ماوەی ئاڤزیو حەمل نو مانگ بوە چەند زور کەمتر یان زیاتر شتیکی ئاساییە . ئەمە تەمەنی منالە ناو زامالد! بەلام دووڕنی یە لە بەر چەند هویەکی نەخوشی و نائاسایی لەدایك یان منال . زان بیتە ئەنجام . لی یا زیاتر لەنو مانگ دەبێت تا رادەیەك بەلام ئەو ماوەیە نو فەرمونە نەبووە وزانست ریگای نەداوەو هەر وەسا کتیبە ئاینی یەکان ژی فەرمودەیان وەسایە . نازانم ئەو سەروچاوەی جەنابت گوتیت لە کوێ هیناوە . لە قورئانی پیروزدا بە ئاشکرایی ئیشارەت بو دەورو پەری نو مانگ کراوە .

※ ب . ر لە شاری هەولیر :

کاکە گیان هەر وەك لە بواری ئول و ئایینداگوتراوە کە «لاحیاء في الدين ـ لاحياء في العلم» ئەبێ ئیمە ش بو ئەوەی هەموو مەسەلەیەکی تەندروستیو ساغلەمی روون و ئاشکرابیت ئەبێ بوت ڕونکەمەوە . چونکە بەشەرم و عەیب وشت شاردنەوەکومەلمان بەرەوپیشەوە ناروات ئاینی ئیسلامیش هیچ شتیکی بەجێ نەهیشتوە باسی نەکات لەبەر ئەوە ئەبێ بلیم . دەست پەر وەك کاریکی نەئاسایی سیکسی و لەبەر ئەوەی شتیکی سروشتی نی یە زیاتر لەوەی کە زەرەرو زیاتر خرابی هەیە ئەگەر بو ماوەیەکی زورو بەبەردەوامی کرا بە رەوشت و دەبێ خو لە زیانی مەسەلەکانی دەروون و نەفسی . زیانی لەشیوگیانی ژی زورە . بەلام واز هینان لە پاش ماوەیەکی زور شتیکی چاکە نەك خەراپ . چونکە هەروەك گوتراوە هەر شتیکی لە توخیبی خوی زیاتربی دەبێ بە دژ ئەگەر هەنگوین خواردنیش بێ .

※ رەشید خلیل شیروانی وحازم چادرشیروانی ژ کومەلگەها حەریری

برایت خوشتەڤی ئەگەرا سپیبینا پرچی ل دەف جحیلا دوو هونە . ئیك : کنیتە «وراثە»ئەڤە ژی پال باب و باپیراڤە مای یان ژی هورمونات . دویر ژی نییە هندەك هویت نوژداریی بی دئالوزین کو نەشیین ل ڤیرە ل سەرب ئاخفین . ئەوی هیژای ئاخفتنی یە کو ئەڤ پرچ سپی بیتە هیچ زەرەرو زیانەکی نابە خشیت . ل بەر ڤی چەندی بلا دلی هەوە جو بیرو فکرو خەترا نەکەت .

※ کاك نامق پەروش

سوپاست دکەین لە بو هەستە ناسکەکەت بەرامبەر گوڤارەکەمان . پرسیارەکەت کە دەربارەی رشانەوەی منالی بچوکە . دەبێ بزانین برا گیان ئەو رشانەوەی توباسی دەکەی نەخوشییەکی تایبەتی نییە کە مشوری بو بخویو بیری لیبکەیەوە وەها بە قولی . بەلکو ئەم دیاردەیە نیشانەیەکی گەلیك نەخوشیترەو بە پیی تەمەن دەگوریت هویەکانی رشانەوە لەمنال :

١) تا لە بەر هەر هویەکی میکروبی یا ڤایروسی .
٢)زور خواردن
٣)هەوکردنی گەرو وناو دەم
٤)هەوکردنی ناو گەدەو ریخولەکان
٥)گورینی جوری شیر . بە تایبەتی شیری قوتو
٦)ژاراوی بوون

و گەلیك هوی تر . ئەوی هیژای گوتنە لیرەوداو ئەبێ بزانریت ئەوە کە هیچ جورە رشانەوەیەك ئەبێ بە سوکی هەلنەگیریت بەلکی ئەبێ زوو بە زوویی مشوری بخوریت و بیریتە لای نوژدار تا چارەسەری بکەن بە دانی موغەزیو ئاوی تایبەتی کە لە توز دروست دەکریت و پیی دەلین Dextrolit نەك بە دەرمان و دەرزی لیدان وبردنی لای ئەو دکتورو ئەم دکتورو چارەسەری رشانەوەش ئەو هندە زەحمەت نییە .

چەند وەلامیکی کورت

---

●روناك صەباح : سلیمانی : بەسەر چاو سوپاست دەکەم

● طارق طە زیوکی ل ئاکری : گەلەك دەست ل وان زلبکا دێ سەر و چاڤیت تە کالی کروم بن .

●سعودی مەئمورسەیری تەندروستی هەولیر پرسیارەکات سەیرە و ترسەکە شت لەم جورە نەخوشییە بێ نرخانە ش سەیرە ودەبێ سەیر نەبێ . چونکە چارەسەرکردنت ئاسان و سەیرە .









# بالندەی هەتاو

● فلیمی «بالندەی هەتاو»گەیشتە قوناغی مونتاج ، دوای ئەوەی کاروباری وینە گرتنی تەواو بوو، ئەم فلیمە رومان بابەتە صاحب حداد دەری هیناوەو جعفر علی سیناریوو کاری سینەماییانەی لە ئەستو گرتووە. دیمەنەکانی دەرەوەی لە پاریزگای نەینەواو دیمەنەکانی ناوەوەش لە شوینی تایبەتی لە بەغدا وینەکیشراون.

● بالندەی هەتاو چیروکی بەسەرهاتی جەنگاوەری سوپای دلیرمان قاسم دلیمی یە کە فروکەکەی لەخاکی ئیرانی دوژمن دا کەوت و لەنزیك سنوری عیراق دا بە چەند کیلومتریك . . خوی فریدایە خوارەوە، ئەگەرچی برینداریش بوو هەر خوی بەدەستەوە نەداو چەند روژ بەهەزار دەردە سەری و بەگیانیکی نەترس و لەخوبردوانە توانی خوی بگەیەنیتە بنکەکانی سوپای عیراق.

● لەم فلیمەدا طعمة تەمیمیو سعدیة زەیدیو کنعان علی دەور یاری دەکەن و دایەرەی سینەماو شانو فلیمەکە بەرهەم دەهینی.

● ذکریات ●







# ئێمەو دەست و خامە ڕەنگینەکان

● جێگری سەرنووسەر ●

## ڕەنگین هەمیشە پێشڕەوە

ئەمە نزیکەی دووساڵە ڕەنگین دەردەچێت و ژمارە بەژمـارە بەرەو پێشـەوە دەڕوات ، سـەدان نامـەمـان بەدەسـت ئەگـات و سی هەزار ژمـارەی لێ چـاپ دەکرێت و دابەش ئەکرێت و لەماوەی یەك هەفتەدا لەبازاڕدا بەرەونەمان دەچێت .

ئەمە نیشانەی شانازییە بۆ (ڕەنگین)و (دەزگای ڕۆشنبیری)و ڕۆژنامە نوسی کوردی ئەم ڕۆژگارەمان وا ئەم ستونەتان ئەخەینە بەردەست تاوەکو بەراوردێك بکەین لەنێوان ئەو نامانەی لەنیوەی یەکەمی ساڵی پارو لەنیوەی یەکەمی ساڵی ئەم ساڵ بەدەستمان گەیشتون :

بەراورد نێوان :

(ساڵی ١٩٨٨و ساڵی ١٩٨٩ )

| | ك ٢ | | شباط | | ئادار | | نیسان | | مایس | | حوزەیران | | کۆ | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | ١٩٨٨ | ١٩٨٩ | ٨٨ | ٨٩ | ٨٨ | ٨٩ | ٨٨ | ٨٩ | ٨٨ | ٨٩ | ٨٨ | ٨٩ | ٨٨ | ٨٩ |
| کیژۆلە | ٢٠ | ٦٤ | ٣٨ | ٥٣ | ٤٢ | ١٠٨ | ٣٢ | ٥٧ | ١٠ | ٨٦ | ٢٢ | ٦٠ | ١٦٤ | ٤٢٨ |
| گزەو | ١٧١ | ١٤٠ | ١٢٧ | ٢٥٥ | ٢١٤ | ٥٣١ | ١٠٣ | ٦٦ | ٣٩ | ١١٨ | ١٢٣ | ١٩٢ | ٧٧٧ | ١٣٠٢ |
| خالەرەجەب | ٢٧ | ١١٨ | ٦٥ | ١٤٧ | ١٢٩ | ٢١٢ | ١٠٦ | ٩١ | ٤٩ | ١٠٧ | ١٣٦ | ٩٢ | ٥١٢ | ٧٦٧ |
| ئیمزا | — | ١٤٧ | ١٩ | ١٦٧ | ٧٢ | ٢٣٢ | ٩٨ | ٩٦ | ٤٤ | ١٣٠ | ١٧٥ | ١١٨ | ٤٠٨ | ٨٩٠ |
| چاوی جەماوەر | — | ٤٣ | ٢٠ | ٤٢ | ١٠ | ٦١ | ٤ | ٢٠ | ٥ | ٢٤ | ١٥ | ٤٢ | ٥٤ | ٢٣٢ |
| چارچییە | ٨ | ٥٥ | ٢٣ | ٥٣ | ٤٢ | ٦٩ | ٣٨ | ٢٤ | ١٤ | ٤٠ | ٤٤ | ٣٢ | ١٦٩ | ٢٧٣ |
| یەکترناسین | - | ٢٥٦ | — | ٤٤٨ | — | ٤٩٥ | — | ٢٧٤ | ٨ | ٣٠٣ | ٥٢ | ٢٦٠ | ٦٠ | ٢٠٣٦ |
| زاخاوی میشك | ٢١ | ٤٤ | ٢٤ | ٦٣ | ٧٥ | ٨٩ | ٤٣ | ٢٨ | ٢٧ | ٣٨ | ٤٠ | ٢٩ | ٢٣٠ | ٢٩١ |
| نوژدار | — | — | — | — | — | ٦ | — | ٣ | — | ١١ | — | ٣ | — | ٢٣ |
| کەرەستە | ٥٠ | ٨٨ | ٨٢ | ٩٦ | ١١٩ | ١٨٢ | ٩٣ | ٥٨ | ٦٣ | ٩٧ | ٨٤ | ٦٥ | ٤٩١ | ٥٨٦ |
| | ٢٩٧ | ٩٥٥ | ٣٩٨ | ١٣٢٤ | ٧٠٣ | ١٩٨٥ | ٥١٧ | ٧١٧ | ٢٥٩ | ٩٥٤ | ٦٩١ | ٨٩٣ | ٢٨٦٥ | ٦٨٢٨ |

لەم ستونەوە بۆمان دەرئەکەوێت :

١ـ کۆی ئەو نامـانـەی لەنـیـوەی یەکـەمی ئەمسـاڵ بۆمـان هاتـوە (٦٨٢٨) نامـەیـەواتـە نزیکـەی سێ ئـەوەنـدەی ساڵـی پـارەکـە (٢٨٦٥)نامەبووە.

٢ـ هەموو گۆشەکان لەپەرەسەندن و پێشکەوتندان .

سەرەرای پەرەسـەنـدن و پێشکەوتنی گۆشـەکان ئێمە بەپێی باوەڕمـان بەدیمـوکـراتیـەت لە ڕۆژنـامەنوسی‌دا ڕووی دەم لەئێوەی ئەدیب و نووسـەران و خوێنـەرانی ئەم گۆڤـارە ڕەنگینـە ئەکـەین کە بیروڕای خۆتان بە ئاشکرا دەربارەی گۆشـەکـان دەربڕن و بۆمان بنوسن فلانـە هۆی ناپەسـەنـدی دەربڕە تاوەکـو نەبێتە ئارەزویەکی ڕووت.

هەروەهـا ئەوەشمـان بۆبنوسن کە چ گۆشەیەکی دیکەتان لا باشەو بۆ ؟ واتە نوسینەکانتان ئەبێت بەبەڵگەوە بێت.

هەر لەم ڕوانگـەیەوە بەپێویستی ئەزانین ئەم خاڵانەتان بخەینە



بەرچاو:

١ـ زۆربەی کەرەستە باشەکانی ناو ئەم گۆڤارە بەدەستی پێمان ئەگات وەك نوسینەکانی مامۆستایان: (جەمیل رۆژبەیانی، د. کەمال مەزهەر، د. عزالدین مصطفی رەسول، عبدالقادر قەزاز، جەمال بابان، مصطفی صالح کەریم) هەروەها لە پەیام نێرە کانمان لە پارێزگاو شارەکانی کوردستانەوە.

٢ـ دان بەوەدا ئەنێین جاروبار هەڵە دەکەوێتە ناو رەنگینەوە چونکە یەك کەس کاروباری (تصحیح) ئەکات و بەس، ئەوەش دەزانن کەپیت چنەکانی چاپخانە کوردی زانیکیان تیادا نیە..

٣ـ رەنگین شانازی بەوەوە دەکات کە زوربەی زۆری کەرەستەکانمان با وردیش بن بەڵام لە کوردستانەوە هەڵ قوڵاون و سود لە کەلەپوری کوردی وەرئەگرن جگە لەوەی لەزمانەکانی (فەرەنسی، ئنگلیزی روسی، ئیسپانی و ئیتالیایی) یەوە کەرەستەی باشمان بۆکراوەتە کوردی و بڵاوکرانەتەوە. نوسینێکی ئێمە کە لە ژمارە (١١)ی ئەیلولی ١٩٨٨ بەناونیشانی (خەوتن ئەوجیهانە پر پەنهانییە کەلە ئنگلیزییەوە کرابوە کوردی، پاش نۆ مانگ بەشێکی زۆری ئەو نوسینە لە گۆڤاری) (الف باء)ی ژمارە (١٠٨١) ی چواردەی حوزەیرانی ١٩٨٩ بەناونیشانی (رحلة الی عالم سری اسمە النوم) بڵاوکرایەوە بێ ئەوەی پەنجەیەك نەبۆ رەنگین و نەبۆ سەرچاوە ئەسڵییەکە درێژبکات.

٤ـ رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانمان لاپەرەکانیان بۆ ئەدیب و نوسەرانمان کردوەتەوە، ئەوی سرنج راکێشە هەندێ لە نوسەران کەرەستەیەك بۆ دوو بڵاوکراوە دەنێرن لە رەنگینی کورپەشدا ئەم رەوشتە رەنگی دایەوە وەك ئەو (شەش کورتە چیرۆکەی) کەلەژمارە چواردا بڵاوکرایەوە پاش دەپانزدە رۆژ دەقاو دەقی لەژمارە (٩٥٣)ی هاوکاریدا دەرچوو.

هەروەها یەکێك لەدوو شەوی کوردی کە لە ژمارە ٣ دابڵاوکرابوەوە لەم دواییەدا بەدەست کاریەوە لە(ئاسۆ) ی ژمارە یەك دا دەرچو.

هەروەها لە رەنگینی ژمارە ٢دا وێنەیەك لەوێنەکانی (قوتابخانە.. وەرزش) لەپاشکۆی عیراق ژمارە ٩٨ دا دەرچوو.

دیسانەوە لە ژمارە (٢٠) ی رەنگین دا (ئەو کورە بووە بەکچ) کە لە گۆڤاری (کل العرب) کرابوە کوردی، کەچی نوسەرێکی دیکە ئەو مەوزوعەی لە پاشکۆی عیراقی ژمارە ٩٨ دا بڵاوکردوەتەوە.

هەرچەندە رەنگین لەم نوسینانەدا پێشرەو بوە بەڵام ئەبوایە بەسەر ئەو رۆژنامەدا تێپەر نەبوایەو ئەو نوسەرانەش لەو جۆرە هەڵانە خۆیان دور بخستایە.

بابیەینە سەرخۆمان و دەرزییەکیش بکەین بەخۆمان دا لەگۆشەی یەکترناسین دا (ملکۆ عەزیز) لەژمارەکانی (دوانزدە پانزدە) وێنەی بڵاوکراوەتەوە، کاك (غنی سعید) لەژمارەکانی (شانزدەو حەڤدە وێنەی بڵاوکراوەتەوە، کاك نەوزاد محمد) یش لەژمارەکانی (دەو هەژدە)دا، کاك (سەرەوەت محمد عەلی صالح) یش لە (پانزدەوشانزدە)دا، ئێمە هاتین بۆ ئەوەی رێگا بەم جۆرە هەڵانە بگرین فەرهەنگی تایبەتیمان بۆ یەکترناسین و غونچەکانی ناو گوڵ و گوڵزار دزوستکردوە.

٦ـ بۆئەوەی لە مەودای کاری یەکترناسین ئاگادار بین بۆمان بنوسن ئاخو بەهۆی ئەم گۆشەیەوە لەگەڵ کێ و کێ یەکترتان ناسیوە..

٧ـ وا گۆشەیەکی نوێ دەهێنینە کایەوە ئەویش ئەوەیە (بپرسەو وەڵام وەربگرە) لەم گۆشەیەدا هەرپرسیارێکی (کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، زانستی، مێژوو، هتد...) مان بۆبێت دەینێرینە لای یەکێك لەو پسپۆرە کوردانەی کەلە بەغداو شوێنانی دیکەن و ناوی هەردوو لاش بڵاوئەکەینەوە (خاوەن پرسیارو وەڵام دەر) بەڵام دەبێ یەك پرسیار بێت و پولێکی سەد فلسی پۆستەی لەگەڵدابێت

٨ـ چەندجارێك بانگەوازمان بڵاوکردوەتەوە وتومانە ئەوی کاغەز بۆ ئەم گۆشانە بنوسێت ئەبێت پولێکی پۆستەی سەد فلسی لەگەڵ بنێرێ (گرەو، یەکترناسین، خاڵەرەجەب، ئیمزا، بپرسەو..) کەچی سەدان کاغەزمان لەوشوێنانەوە بەدەست ئەگات کەپۆستەخانەیان تیادایەو پولیان ناردوە ژمارەیان لە پێنچەد تێپەریوە وەك کاکار محمد حسین. شێرزاد صالح صابر عەزیز. فیض اللە حمە قاسم کریم. بیمار رۆژبەیانی. سعدیە قاسم. جلال دەربەندی. احمد شوان. احمد عبدالرحمن. چالاك حسین. عبدالخالق احمد. عطا شوان. احمد عبدالرحمن. چالاك حسین. عطا رؤوف (وتوشمانە لە کاغەزێك دا یەك جۆرە نوسین بنێرن کەچی (دڵپاك ئاوارە) مان لەیەك کاغەزدا) کاریکاتێر و ئیمزاو مەتەڵ و زاخاوی مێشك و چی و چی تێکەڵاو کردوە هەروەها (لقمان حسین) یش قوورینەکردوە. جگە لەوەی چەندجار وتومانە لەسەر زەرفی کاغەزەکە ناوی (گۆشە) بنوسە باوەربکەن سەدان کاغەز لەبەرکەمتەرخەمی خاوەنەکانیان سەریان تیاچوە.

٩ـ رەنگین تام و بۆی خۆی هەیە بابەتەکانی کورت و رەنگین دەبن، بێ وێنە شت ناروات، شیعرمان ناوێت شیعرمان بەسەردا دەباریو ئەتوینەوەو ئەخرێنە پشت هەردووگوێوە

١٠ـ نوسینەکانتان ئەبێت لەدیوێکی کاغەزەکەدا بێت و خاڵ و ویرگول لە جێی خۆیدا بێت، ئەی ئەمەندە دوعاو سەلامە بۆچییە کەبۆ سەر نوسەرو جێگرو سکرتێرو نزار بەزازی ئەنێرن. ئەم چەرخە چەرخی خێرا کردنەو درێژداری پێناوی هەمووتان خوشك و برای ئازیزی ئێمەن، ئیتر دەستمان نە هەویرەو ئەوەندەمان لەبیرە

# هەڤا لینیا دكتور مسعود دگەل
## ئەمر نالبەند

## كتیبەك یا بەرهەڤكری لسەر میژویا ئامێدیێ و دگەل دیوانا نالبەند

ژ سالێت حەفتێ هێش ئەم بچیـك دەمێ مە هنـدەك جارا هوزانێـت رەحمـەتێ نالبەندی دخاندن دا جار جارا ناڤێ (هـوزانڤان مسعود كتانی )دناڤ هوزانێت نالبـەنـدی. دێت ... دا راوەسـتین ودا بێــژینــە خو ئەرێ ئەڤ مسعـود كتـانی دێ كی بیـت و كا بەرهـەم و هوزانـێـت وی. ئـو دەمـێ مە پسـیـارا د. مسعودی دكـر دا بێـژن شاعـرەكـە گەلـەك گەلـەك هەڤـالێ احمـد نالبەندیبو فەرمانبەرە لدائیرا چاندنا ئامێـدیێ. لێ ئەڤـە چەنـد سالەكە یێ چویە ئەلمانیا روژئاڤا بو خاندنێ وەرگـرتنـا پروناما (دكتوراییێ). ئو هوسـانێ ژهنگیو هەتـا نهـو یامـایە دسـەرێ مەدا كو روژەكـێ ئەم. مسعـود كتانی ببینین ونیاسینێ دگەل بكـەین. هـەتـا بەری هەیـامەكی پشـتـی مە زانـی یێ ئاكـنجـی یە لكـولیجـا چانـدنێ و دارسـتـانا لقەزا حمام العلیل لپارێزگەها میسل ڤێجا مە بریار دا ئەم بچینە سەرەدانا ویو بكـەینـە میهڤـانێ رەنگین یێ ڤێ ژمارێ

د. مسعود كێیە؟!

= ئەز مـسـعـود مصطفی سعیـد بابـا حجی كتـانی مەلــالا ١٩٣١ ئـەز لـباژێـرێ ئامێـدیێ هاتیمە دونیاییو پشـتـی خانــدنــا من و پشـتـی من ئامـوژگـاریـا چانـدنێ لدەڤەرا (ابی غریب)لسالا ١٩٥٣ بدیماهی ئیناى ئەز بومـە فەرمانبەرێ دائیرا چاندنێ لقــەزا ئامـێـدیـێ هەتــا سالا ١٩٦٠ پـاشی ئەز چومـە ئەلمـانیـا روژئـاڤا بو خاندنا بالا لدور بابەتێ دارستـانا ئوپشتی من بروناما دكتورا وەرگـرتێ لدور (دارستـان و پەزێ كیڤی)ل ئەلمـانیـا غربیو لــسالا ١٩٧٤ ئەز هاتیمە تەعین كرن لسەر كادرێ زانكـویـا میـسـل كولیجـا چانـدێو دارسـتـانـا ولــسـالا ١٩٧٩ئەزێ هاتیمە دامەزراندن كە مستشـارەكێ زانـستی ل چڤـاتـا بلند یاچـانـدێو لـسـالا ١٩٨٢ئەز بوومە بسـپـورێ هاریـكـار (استـاذ مسـاعـد)ولسالا ١٩٨٨ئـەز بوومە سەروكێ پشكـا دارستـانـا لكولیجا چاندن و دارستانێلزانكویا میسل و هەتا نهو.

**●دكتــور ژكــە نگیو چاوا تە هوزان ڤەهاندیە؟!**

= چنكی ئەز لنـاڤ خێـزانــەكـا رەوشەنبیر و ئەدب و هوزان پەرێسی دایێ رابوم. هەلبـەت من ژی حەژ ئەدەب و كەلەپورو میژویا گەلێ خو









کرو هێدی هێدی من هوزان ڤەهاندن ولسالا ١٩٤٥ ئەز شیام ئێکەمین هوزان فەهینم وژ وێ بەرواریو هەتا ئەڤرو ئەزێ بەردەوامم لسەر ڤەهاندنا هوزانێ

**● دکتور ژتوری کوردی وعەرەبی بیانی تو پتر حەژ هوزانێت کێ دکەی و هەمی جارا دخوینیەڤە؟!**

=ژهوزا نڤانێت کورد سەرپشك ئەندازیاری هوزانێ جزیری وپاشی خانیو باتەیو خالدآغا زیاری ئو ژهوزا نڤانێت عەرەب سەربشك محمد مهدی الجواهري و السیاب والمتنبي وعبدالرزاق عبدالواحد.

ئو ژتوری بیانی سەرپشك بلزاك وگوتەو برێخت و شیللر.

**● خویایە کو تەو نالبەندێ بها گران هەڤالینی دگەل یەك هەبو. کەنگیو چاوا؟!**

= ئاخینکەك راهێلاو راوەستیا. پاشی گوت ئەرێ ولێلاکاك وصفی ئەزو نالبەند روحەك و گیانەك بوین و هەڤالینیا مە دەست پێکر لسالا ١٩٤٥ چنکو ل وی دەمی بابێ من هوزانڤان حجی مصطفی هەژمارەکا فەقیا هەبو. ئەڤجا ئێك ژوان رەحمەتی نالبەند بوو ونالبەند سالا ١٩٤٥ولسالا ١٩٤٦ لخاندگەها بابێ من دنڤست و هوسانیو ب ریکا ئەدەب و هوزانا هەڤالینیا مە زور زور بهێزکەفت و هەر جار جارا مە بەریکانیا هوزانا دکر (مناظره) دکر.

**● باشە وەك تێکەلەکێ نێزیك و نالبەندی. تە چاوا نالبەند ددیت؟!**

= جارێ وەك مروڤ گەلەکێ ئاسان بو. مروڤەکێ گەل پەریس و صوفی بوو. لێ نالبەندی گەلەك گەلەك گازندە دکرن دکرن ژفەقیریێو ژاریێ بێریت بووچ ددەستادا نەبو وژبەر ڤێ فەقیریێ تووشێ بێزی گەلەك کریێت نەفس بو وهەردەم تووشی دەر بەردەیێ دبو.. ئەڤە ژلایەکی وژلایەکێ دیڤە وەك هوزانڤان بەراستی گەلەکێ ب بەرهەم بوو هوستایەکێ خێر بوو دهونەرێ وەسفیدا وگەلەك رەهوان بو ژبوو دانانا هوزانێ یانکو دشیا ددەهـ دقیقادا هوزانەکا چل پەری بێژیت. ئاخ.. ئاخ مرن.. مخابن بو نالبەندی شاعیر و مروڤ و ژار.. رەحمەت لسەر بن...

**بابێ فەرهاد کەنکی شعر بوتە دهێت؟!**

= بەهرا پتر دشەڤێدا؟!

**●ئەرێ شیعر ئیلهامە یانەء؟!**

= زور ب کورتی بەلێ شیعر ئیلهامە.

**●دکتور تەچ بەرهەمێ چاپکری هەیە؟!**

= بەرهەمێت چاپکری بەهرا پتر دزانستی نەو ئەڤەنە.

١- پەرتوکا (الحیوانات البریة والصید عبر العصور) لسالا ١٩٦٠

٢- پەرتوکا (صیانە الغابات)

٣- پەرتوکا (اسس بایولوجیەو ادارە الحیوانات البریە) هزار بەرپەرە؟

٤- پەرتوکا (الزراعە الدیمیە في شمال العراق) سالا ١٩٨٠

**●دکتور تەچ بەرهەم هەیە ئامادەیە بو چاپێ؟!**

= ١- پەرتوکەك ب زمانێ عەرەبی بناڤێ (تأریخ العمادیة منذ اقدم العصور الی یومنا هذا)

٢- پەرتوکەك بناڤێ (رها ئەزمانێ کوردی ودەست دریژییت فارسا)

٣- پەرتوکەك بناڤێ (صیانە الطبیعە والسیاحة في العالم)

٤- دیوانا حەمکێ توڤی.

٥- دیوانەکا ئەحمەدێ نالبەند ب خەتێ دەستێ وی.



٦ـ دوو دیـوانێت هوزانێت من نهو لژێـر چاپێ لـه مێـنـداریا گشتی و رەوشەنبیری ولاوان
٧ـ پەرتـوکـەك لژێـر ناڤـی (النبـاتات الطبیه و العطریه في العالم) دوو پشکن . نهو لژێر چاپه لزانکویا مێسل
٨ـ پەرتـوکـەك بناڤی الساحه و المتنـزهـات ٧٠٠ پەرە ژبلی چەنـدەها لیکولینێت زانستی و گوتـارێـت ئەدەبی وچـەنـد گوتارەك لسەر شوری بیانی . .
● یابی فەرهـادی تو چەنـد ئەزمانا دزانی؟!
= ئـەز ڤان ئەزمانا دزانم المانی انـگلیـزی ، ترکی ، فارسی ، عربی تڤیـبنـا لاتینی وژبلی کوردی و وسـریـانی وزاری سورانی بێ گومان بنڤیسین ڤە . . ؟
● دکتـور . . مـە ژئشکـەکی ڤەیی زانی تو ژمێـژە خەریکی داتـانـا قاموسەکی . . چما ئه بەحس نەکر ؟!
= بـەلێ ژدیمـا سالێت چلی و هەتـا ئەڤرو ئەزێ مژیلم ب کومکـرنـا پەیڤ و رستا ژبـو داتـانـا فەرهـەنگەکا کوردی یا مەو لڤـی دیمـاهـی ژێ ب راستی کورێ من هوزانڤـان (دلشـاد)ئـەخسیـرێی ناکـەت وگـەلەك هاریکاریا من دکەت بو ڤی چەندی وهـەتـا نهو من (٤٠٠٠٠)چـل هزار پەیـڤ یێت کومکـرین ولـدیڤ تیێت ئەبجـەدی ولـەوامێ بەحس

ئەکـر چنکـو هەتـا نهو تمام ئەبـوویـەو تێنی دوو پیت یێت ماین ئەو ژی پیتـا (ن)و (ف)

. لێ بنـاتەهیا خودی دێ ڤان سالـێت نێـزیـك روناهـی بینیت . . هیـڤیایان هەر چەندا

دکتـور مسعود مصطفی کتانی گەلـەك ژویـری مەزنترە کو هەمی لایـەنێت ژیـانـا وی

وهـزوو بیـرێت وی بهێتـە ناسین چاڤهیـکـەتـەکـ هوسـادا . . چنکـو د. مسعود

ئەوە یێ جەگـەرخوینی مەزن بەحسـی وی کری و گوتـی (ئـەڤێ هەنێ مسعـود کتانی

پێتڤیـە تشتێ وی انتـاجی وی یێت بەلاڤکـرن چنکـو ئەم دشێین قاموسەکێ ژزمانێ وی

چێ کەین زمان زانه ) .
لدیمـاهیێ ژی ئەم دێ لڤێـرە دەستـویریێ ژد. مسعود کتانی

خازین وگـەلـەك سوپاسیاوی دکـەین . . لدیـمـاهیێ د. مسعود کتانی گوت ئەز گەلەك

سوپـاسیا گوڤارا رەنگین دکەم کە خوشتڤیـا رەوشـەنبیـر و هوزانڤان وهەمی خوێندەواریە . .

● وصفی حسن ردینی ●

| گۆڤاری | رەنگین | کەوتە | ناوگۆلان | |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| +٣١٧ | +٣٣٥ | +٤٣٦ | ١٦٤ | = ١٢٥٢ |
| گەش بون | چاوانو | دڵ چاك | هەڵقولان | |
| +٣٨٣ | +٦٧ | +٥٨ | ٢٢٧ | = ٧٣٥ |

١٩٨٧زایینی

## گۆڤاری رەنگین هاتە ناوەوە
## خامەی نووسەران کەوتە باوەوە

● عبدالرحمن مفتی ●

ئەمرۆ گۆڤارێکیان بە دیاری بۆ هێنام .
ئەمەندە جوان بوو لەلام . . .
لە خۆشیان دا سەرسام مام . . . . . .
کەروانیم بە رەنگی سوور **نوسراوە**
[رەنگین] . . . .
لە ژێریا وێنەی کچێکی گوڵ **ڕوو وەك**
[نەسرین] . . .
لە پشتی لاپەرەی **هەرە دوایشیا وێنەی**
کیژۆڵەیەکی **ناسکۆڵەی چاوگەلاوێژی**
رازاوە .
هەر وەك **بووکـێ کە تازە ئەبـرێ بە بووکی**
واجوان سازاوە . . .
بە جلی **کوردیو پەرچەم و پرچی**
هۆنراوە . . . . .
سەرپەرچەم **لیرەو عاشق بەند لە مل**
، هەڵواسراوە
کە چاوی **تێبڕی جوانتر لە**
[شیرین] .
هەر سەیرم ئەکرد**و تێرم لێ نە ئەخوارد بەبیرو**
یادی دێرین . . . . .
بولبولی شەیدای **دڵ و گیان** . .
قەفەزی سینەی هەڵ دڕیو
دایەکێوان . . . . . . .
لەهەورامان . . . . . .
لەچیاکانی **کوردوستان** . . . . .
کوردستانی[رەنگین] . .
ئاوای لێ کردم (رەنگین)
تلاوتلی پێ دام شەپۆلی [ئەوین] . . . .

سابیر کوردستانی دەڵێ:

# ماڵی بێ ئافرەت وەکو بیابان وەهایە



میللەتی کورد خاوەن چەندەها دەنگ خوش و نەغمەخوانی بەرزو دی بزوینە. بە دریژایی روژگار چریکەی دەنگی گورانی بیژانی کورد دلی کومەلانی هیناوەتە هەژان. (سابیر کوردستانی) یەکیکە لەو گورانی بیژانەی ریچکەیەکی تایبەتی خوی هەیەو بە دەنگ و گوتنی تایبەتی خوی خانەیەکی دیاری داگیر کردوە لە دنیای ئاوازو گورانی کوردیدا بو بەسەرکردنەوەی ئەم زانە چەند پرسیاریکمان روو بەرووی کردەوە.

پ: کاك (سابیر) گورانی ئەمروی کوردی چون هەل دەسەنگینی؟ بەتایبەتی ئیقاعی خیرا زیاتر هەست دەبزوینی ،تو دەلیی چی؟

و: بەری من گورانی ئەمروی کوردی دوورە لەکەن ئەم بیرەی کە چەند سیت لەمەوپیش بیرم لیی ئەکردەوە. چونکە من بەهیوای ئەوە بووم کەوا گورانیو موسیقای دوردی روژ بە روژ، سال بەسال بەرەو پیشکەوتن بروات هونەرمەندانی کورد زیاتر خویان ماندوو بکەن و یارمەتی یەکتر بدەن و هوکار بن لەگەل یەکا، بو پیش خستنی هونەری کوردی بەگشتی ، گورانی تایبەتی . بەلی ئەتوانم بلیم چەند گورانی بیژو هونەرمەندیرە سەن خزمەتی هونەری کوردیان کرەو جیگەی خویان کردوتەوە لە دلی جەماوەرداو داری هونەریان رواند ، بەلام بەشیکی زوریش لەم گورانی بیژانەی ئیستاً بەلاسایی کردنەوەی گورانی بیگانە ناویان لە خویان ناوە هونەرمەندو خویان بە داری هونەرەوە هەلواسیوە ،ئەگەر بەم جورە بی لە ریشەوە هەل ئەکەندریو گورانی کوردی بەرەو لاواز بوون ئەچی. هەروەها مەرج نیە ئیقاعی خیرا هەست بزوین بی ئەواتی تر ناهەر نەغمەیەك یان هەر چەشنە ئیقاعیك تام وچیژی خوی هەیەو هەر یەك لەمانە بە جوریك هەست ئەبزوینن.

پ: تو لە بواری کیشە کومەلایەتیکان بە تایبەتی کچ بە شوودان گورانیت گوتووە، ئەم شیعرانە هی کین وچونت بە خەیال دا هات؟! ئایا شتی تازەت لەم بوارەدا نییە؟!

و: بەلی من تا نیستا (٣)گورانیم تومار کردووە دەربارەی کیشەی کچ بەشوودان بو نمونە گورانی : (کچ دەلی، شیر بایی)ئەمانە لە هونراوەی خومن . هەروەها گورانی: کچ بەنابە دل) لە هونراوەی (محمد امین کاردوخی)یە، زور لەو کچانەی کەوا تووشی ئەم گیروگرفتە بیوون تووشی چارەنووسی رەش دەهاتن، منیش وام بە چاك زانی چەند گورانیەك بلیم بو چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە، بەلی ئیستاش گورانیەکی تازەم هەیە لە هەلیکی گونجاودا نیازم وایە کە توماری بکەم

پ: ئاواتت بو موسیقاو گورانی کوردی؟!

و: هیوا دارم ئەو تیپانەی کە لە کوردستانا هەن زیاتر بایەخ بدەن بە گورانی بیژەکان ، هەروەها گورانی بیژەکانیش هاوکاری بکەن لەگەل تیپەکانا بو پیش خستنی گورانیو موسیقای کوردی. مەبەستم ئەو کەسانەنین کە بازرگانی بە هونەرەوە دەکەن. بەلکو مەبەستم هونەرمەندی راستەقینەیە.

پ: حەز دەکەی لەگەل چ تیپیکا بەشداری بکەیت؟!

و: ئەوەی راستیبی هەر تیپیك لە کوردستانا کە پیویستی بەمن بی ئامادەم بەشداریان لەگەلدا بکەم، بەمەرجیك کە بتوانین بە یارمەتی هەموو لایەکمان خزمەت بە گەلەکەمان بگەیەنین.

پ: ئایا هیچ ئامیریکی موسیقا دەژەنی؟!

و: بەلی ئامیری (نایو عود)دەژەنم.

پ: بی لە شیعری سەروادار بیرت لە شیعری سەربەست کردوتەوە بو گورانی؟

و: بەلی نیازم وایە ئاواز بو چەند هونراوەیەکی کوردی دانیم و بە گورانی بیانلیم.

پ: جگە لەو ئاوازانەی کەخوت داتناوە هیچ ئاواز دانەریك ئاوازی بو داناوی؟!

و: بەلی سەرەرای ئەو ئاوازانەی خوم دام ناوە ماموستای خوالی خوش بوو (عەلی مەردان) دوو ئاوازی بو داناوم.

پ: ئاخو سابر کوردستانی چون لە خوشەویستیو ئافرەت دەروانیت؟

و: بەرای من ژیانی بی خوشەویستی هەروەکو لاشەی بی گیان وایە، ماڵی بی ئافرەتیش وەکو بیابان وایە

* * *

هونەرمەندمان ناوی تەواوی (سابیر محەمەد ئەحمەد)ە، لەسالی ١٩٥٥دا لە ناوچەی کەرکوك هاتوتە دنیاوە. نیستاش لە شاری کەرکوك نیشتەجییە، فەرمانبەرە لە تەلەفزیونی کەرکوك.

● سەعوللا شیخانی ●

# دورگەی سان لوکاس .. یان.. ناوێکی نەگبەت



## بەندیخانەیەکی

## بەهەشت

### کۆمارێکی سێ رۆژ تەمەن

چ لەوە خۆشتــره رۆژانی بێ ئیشیو پشــوو لەدورگــەیــه کی ناو ئاوی روون و شیــنــی دەریــادا بەســەربــەریــت کە دارمــۆزو دارگــوێــری کەڵــەگــەت سێبــەری لێبــکــەن و بەرۆژ خەریــکــی راوەمــاســی بیــت و لە بەســت و کەنــاران پیــاســەو مەلــەوانــی و ئاوەخلیسکێو یاری بکەیت؟!

له کەنــداوی نیــفــویــا لە کۆستکاریکادا دورگەیه کی بچووك هەیــه ناوی سان لوکــاســه . ٢٥٠کــەس لەو بەهــەشــتــه چکۆلەیەدا دەژین . بەڵام کەس رێی تێ ناکــەوێو ناتوانێ تێیدا بژیت تا یاســاشکێن نەبێت . چونکه ئەوانەی لەوێ دەژیــن یان پیــاوکــوژی یان جەردەییان دزیو گزیو فزیان کردووه .

ئەم دورگەیەی کە ناونراوە «دورگەی ئاوات «یــان» بەهــەشتــه چکــولــه» بەنــدیخــانــەیــەکی تایبــەتییــه ، لە کوستاریکا بەمایەی نەگبەتی دادەنێن ئەمــەش شتێکی نهێنیو ناکــوکــه . چونکــه بەلای زۆر کەسەوە نمونەی ئەو دیمــوکــراتیــەتــەیــه کە ئەو ولاته سەدســاڵ زیــاترە هەیەتی لە کاتێکدا کە لەولاتــانــی تری ئەمــریــکــای ناوەراست دا دیمــوکــراتیــەت قاتەو دەست ناکەوێ!

وەکــو گوتمــان سان لوکــاس ناوەکــەی شووم و نەگبــەتییــه بۆیــه نابینی گونــدێــك یان قوتــابخانەیەك یان کڵێــسەیەك لەکۆستاریکا بەو ناوە ناونرابێت . چونکە شوێنەکە ئازارو دەردەســـەری وەبــیــر خەڵــکــی دەخاتەوە، کەوا لەساڵانی بیستی ئەم سەدەیــەدا بەنــدیخــانــەیــەکی لێ دروست کرا نمــوونــەی دورگــەی شەیتــانــانی کایین بۆ ئەوەبوو بێتــه (ســەوزە دۆزەخــێــك)کــەوا دەردەدارانــی کولێــراو لەرزوتــاو تاعــوونــی تێدا گیــر بکــرێــت ، ئەمانەش نەدەبرانە ئەوێ تا بەجارێ






لێیان بێ ئومێد نەبوونایە، ئەوسا کەلەبچەکانیان لەدەست دەکردنەوە تا دەست بەزنجیرەوە نەمرن و ئەوەی لەژیانی ئەم دورگەیەیان بەردەکەوت هەر کلۆلیو دەردەسەری و تەنیاییو نەساغیو کینەو دڵرەقیو سەرشۆری بوو.

ئەمە جاران واوبوو، بەلام ئێستا هەمووشتێك گۆڕاوەو بەندیخانەکە بووەتە بەهەشت و دورگەکەش بووەتە دورگەی ئاوات و دیموکراتیو کەیف و خۆشی

## سەر کۆماری بەندیخانە

ئەم دورگە چەپەك ولە جیهان پەناگرتووە ،لە دوادوای ساڵانی چلەکان دا لە دورگەیەکی بەندیخانەوە بوویە دورگەیەکی بەهەشت ، کەوا وەکو چیرۆك یەك بۆیەکی دەگێڕێتە ، جەنەڕال فیناسیو کە بەڕێوەبەری دورگە کەبوو. ڕۆژێك ڕەعیەتەکەی خۆی کۆکردەوە کەحەپسەکانن خوتبەی بۆدان و گوتی:

کوڕێنە من. ئەم قسەی من بۆ ئێوە هەمووتانە: ئەی پاسەوان، حەپس، کۆیلە، دزانی کورگەلی من و ڕێگران و تاوانباران و گیرفان برو شێت و وێنە دوور خراوەکان! ئەی ئەوانەی دەست بە کەلەبچەو زنجیرن! وا لەبەردەمی ئێوە هەمووتان دا رای دەگەیەنم کە دورگەی سان لوکاس سەربەخۆیی خۆی وەرگرت و ئیتر سەربەست و خاوەن دەسەلاتی خۆیەتیو کردمان بەکۆمار! لەئێستا بەولاوە بەندیخانە مردو کۆماری نوێ دەژیت. کۆماری سان لوکاس. بێ گومان جەنەڕال فیناسیو خۆشی کرد بە سەرکۆماری دورگە. ئەوجا بەندیو پاسەوانانی لەگەڵ یەکتری ئاشت کردەوەو بەبێ جیاوازی سەربازو کاردەبەست و وەزیری لێ دانان و داوای کرد خێزانانی خەڵکەکەش بێنە دورگەو خەریکی چاندن بن گوتیشی خوام لەو خوایەی یەکێك ڕابکات! هەر کەسێك هەوڵ بدات لە خاکی کۆماری نوێ پەلەقاژەی دەرچوون بکات جەزای کوشتنە!

بەلام کاربەدەستانی کۆستاریکا بەمە رازی نەبوون، بەڵکو پەلاماری دورگەکەیان داو داگیریان کرد، سەرکۆمار ناچار کرا خۆی بەدەستەوە بدات. ئەو خەونە خۆشەش بوو بەخەونی مێردەزمەو هەرسێ ڕۆژ دەوامی کرد بەلام ئەم سێ ڕۆژە لەبەر دڵی حەپسەکان نەمریو مانی سەربەستی دەهێناو ئیتر جارێکی دی دورگەکە بووەوە بەندیخانە. بەلام بەرەبەرە کاروبار دەستی بەگۆڕان کردو چاك کردن و دەستکاری بەندیخانەکەی گرتەوەو باری شت باش و باشتر بوو. تا وای لێهات سان لوکاس بوو بە بەندیخانەیەکی نموونەو هەر تاونبارێك ئەمرو بیرێتە ئەوێ دەبێ لە چەند جۆر تاقیکردنەوە دەربچێت و پیشانیبدات کەشایانی ئەوەیە بچێتە ناو ئەو بەندیخانە نموونەییەوە. کاربەدەستانی کۆستاریکاش بەوردی لە حالی تاوانباران دەکۆڵنەوەو ئەوانەیان لێ هەڵدەبژێرن کە بۆ ژینی ئارامی دورگەکە دەست دەدەن و کارێکی وا ناقەومێنن کە باری ژیان تێك بدات و ئامادەی تاوانی نوێ نین بەم جۆرە ئێستا وای لێ هاتووە سان لوکاس ببێتە (دەزگا)یەکی راست کردنەوەی خوو رەوشت و فێرکردنەوەی ژینی سەربەرزانە.

هەرکەسێکی نوێشی بۆ بێت دوو هەفتە لە(ئەعراف)ی پێش بەهەشت بەرنامەیەکی تاقیکردنەوە بەجێ دەهێنێ.





### «کاروپیشەو چالاکی»

دورگەکە ١٧٠٠ هیکتار دارستان و بەست وکەناری هەیەو پیاو بە رۆژێك بەپێ دەتوانێ هەموو خاکی دورگەکە بگەڕێت ، کەوا هەشت کۆمەڵ یان گەڕەکە خانوو دەبینێ شوورەیەکیان بە دەوردا دروست کراوە کە بریتییە لە پەرژینێك بەئاسانی بازی بەسەردا دەدرێت . ئیتر زیندان و چرای پڕۆچیکتەر تەلبەنی کارەبای لێ نییە . بەرۆژیش هەر حەپسێك بۆ هەرکوێیەك بیەوێ دەتوانێ بچێت و گەلێ جۆر کاروچالاکی بۆ رەخساوە . هەریەکێك پێویستە رۆژی چوار سەعات ئیش بکات : راوەماسی ، چاککردنەوەی مەکینەو دامودەزگا ، پەتاتەو گەنمەشامی چاندن ، بەخێوکردنی مەڕومالآت و پەلەور، چێشت لێنان و سفرە ئامادەکردن .

ئەوەتانێ میگیل دی (گاوان)شانازی بە کاری لەو دورگەیەوە دەکات و دەڵێ : «من کاوبۆیەکی راستەقینەم ، یەکسم و گاوگوڵ و پەز بەخێودەکەم . پێش هاتنە ئێرەم هیچ ئیشێکم نەدەکرد . لێرە فێری چاندن و مەڕومالآت داری بووم هەر رۆژێك حەوت فرەنگ پەیدا دەکەم . بەڵێ شانازی بەئیشەکەم و بە (ئازادی)یەوە دەکەم . ئەی لێرەنەبێت ئازادی لە کوێیە؟»

کاك میگیل دی بە شەش ساڵ بەندی حوکم دراوە، بەڵام هەر دوو رۆژ ئیش کردن رۆژێکی حەپسەکەی کەم دەکەنەوە، مانای وایە پاش چوار ساڵان بۆ خۆی سەربەست دەبێت .

پاش ئەم چوار سەعاتە هەندێکیان لەدار پەیکەر دەتاشن و هەندێکیشیان تۆپی پێ یاری دەکەن ، یان سواری ئەسپ دەبن هەندێکیش دەچنە قوتابخانە .

بەڵام سەیرترین شت لەم دورگەیەدا مەسەلەی ئاشنایەتی نێوان پاسەوانان و حەپسەکانە . . ئەنتونیو ئیفی پاسەوان بارەیەوە دەڵێ «ئێمە پێکەوە هەموو شتێك دەکەین ، تۆپێپێ . راوەماسی و کاری دی . لە جیاتی دار (سایکولوجی)و دەروون ناسی بەکاردەهێنین . ئەوانەی سەیری دورگەکە بکەن بەزەحمەت . لێکمان جوێ دەکەنەوە ، چونکە جل و بەرگمان وەکوویەکەو زوربەمان سینگ رووتین و چەکیش هەڵناگرین . . چەکەکان زۆرتر هەر لە جبەخانەکان بۆ جوانی بەدارەوە هەڵدەواسرێن!!»

بەڵام ئەنتونیو . ئیف دەڵێ «خۆ حەپسەکانیش فریشتە نین ، جاروبار هەندێ گەڕو گێچەڵ و شەڕو هەندێ جار تلیاك کێشان روو دەدات خوئەگەر هەموویان یاخی بن ئەوا ئێمە پەکمان دەکەوێت جونکە هەر پاسەوانێك حەوت بەندیی بەردەکەوێ . . بەڵام لە راستی پشت بە پەیرەوی خۆیی دەبەستین . بۆیە لای ئەو پیاوانە ئێرە خۆشترین جێی هەموودنیایە

ئێرە ئەگەر بەهەشتیش بێت ، ناو ناو هەیە حەز بە لێ دەرچوونی بکات ، کەوا هەر ساڵێك لەو ٢٥٠ کەسە بیست کەس تەقەلای راکردن دەکات . . بەڵام لێرەوە تا بگەیتە وشکانیی بەرامبەرت سێ تا چوار رۆژ مەلەوانیت دەوێت . جا کێ هەیە ئەوەندە گورج و نەبەز بێت بتوانێت خۆی دەرباز بکات؟

بۆیە زوربەی راکردووەکان بەدەست دەکرێنەوەو دووبارە دێنەوە دورگە ، هەندێکیش درنە ماسی دەیان خوات یان رێزاوی بەتەوژمی ئاو تێکیان دەشکێنێت، جا ئەوەی نەگەڕێتەوەو بێ سەروشوێنی بێت نازانین مردووە یان رزگاری بووە؟

## ژن و منداڵی بەندیخانەییەکان

رۆژی پشووی حەفتەش یەکشەمەیە ، لەم رۆژەدا کۆنە بەلەمی (لانشا) بەکۆمەڵ لە بنداریناسەوە بە خۆیان و پێداویستی دورگەکەو دۆست و خزم و ژنانەوە ، بەباری میوەو ساردەمەنیو کێك و حەلواوە دەگەنەسان لوکاس . . ئەنتونیو ئیف سەردەستەی پاسەوانان دەڵێ : «ئێمە پێمان خۆشە خێزانە کان بەرێکی بێنە ئێرە . کە کابرای حەپس لە خێزانە کەیەوە نزیك بێت پێوەندی نێوان کۆمەڵگە پتەوو توندوتۆڵ دەبێت و بەهۆی سەردانی رێکوپێکی خێزانەوە حەپسەکە بیری کرژو ئاڵۆز نابێت و دەست بۆ توندوتیژی نابات ، سەرباری ئەمانەش هەر مانگێك ماوە بەژنی حەپسەکان دەدرێت کە ٤ ـ ٨ رۆژ لەگەڵ مێردەکانیان و منداڵانی تەمەن لە ١٢ساڵ کەمتریان لە دورگەکە بمێننەوە . خاتوو ئولما ژنی کابرایەکی راهێنەری تۆپی پێیە وا دەساڵە بەرێکی سەری دورگەکە دەدات و دەڵێ : «دێم تا خزمەتی مێردەکەم بکەم . چێشتی بۆ لێ دەنێم . جل وبەرگی دەشۆم و لە ئوتووی دەدەم . . لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە هەشت رۆژ لە مانگێکدا پێکەوە سەیری منداڵە کانمان دەکەین . بەراستی ژیان لێرە هێمایییەو لەهەموو جێیەکیدی خۆشترە . بەراستی کە مێردەکەم دەربچێت تووشی بەڵای خۆمان دەبین» !

ئەوەی رەچاوکراوە لەم دورگەیە ئەوەیە ٨٠٪ حەپسەکان چەند جارێك ئاوان دووبارە دەکەنەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە جێگەکەی خۆیان . ئەگەر راستیشت دەوێ تەنگوچەڵەمەی ئابووریوبێکاری ئەو حەپسانە دەهارن کە دەردەچن . . بۆیە زوربەیان ئەم بەهەشتە بچووکەیان لە دۆزەخە گەورەکەی شاران پێ باشترە . کەوابێت ئەمە ئەو بەندیخانەیە کە پیاو دەتوانێت رۆژێکی بەخۆشی تێدا بەسەر بەرێت .

ئامادەکرنی

● هوشیار علی عزیز ●



١

تەنیا بۆ ئافرەتان

# چۆن مێردەکەت لەقەڵەوی دوور دەخەیتەوە

لەکۆمەڵی ڕۆژهەڵات دا ، زۆربەی هەرە زۆری ئافرەتان لە دەست قەڵەوی مێردەکانیان بێزار بوون و هەوڵی ئەو دەدەن کە لەم گیروگرفتە رزگاریان بێت و لەبەر ئەم هۆیە پەنایان بردووەتە بەر پزیشك لاپەرەی گۆڤارە تەندروستی یەکان بۆ چارە سەرکردنی ئەم گیروگرفتە . . ئێمەش بۆ ئامۆژگاری بە هەموو ئافرەتان دەڵێین . . ئەم گیروگرفتە زۆر ئاسایی یەو دەتوانێت بە گوێ گرتنت لەم چەند ئامۆژگاریانەدا کە لە پێناوی ئەم بابەتەدا باسی دەکەین سوودی لێ وەربگریت .

لە یەکێك لە گۆڤارە بێگانەکان دا ئافرەتێك توانای ئەوەی هەبووە کە بۆ ماوەیەکی کورت، بۆ ماوەی حەوت مانگ ، توانی یارمەتی ی مێردەکەی بدات و ٣٥کغم لە قورسایی کەم بکاتەوەو ئەمەش بەم جۆرەی خوارەوە بووە :-

خاوەنی تاقی کردنەوەکە دەڵێت : پاش ماندوو بوونێکی زۆر . . بریاری ئەوەم دا کە لەگەڵ مێردەکەم دا ڕێك بکەوم و بە قسەی ‹لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی› بکەین و رایەك بۆ ئەم گیروگرفتە دابنێین کە هۆی سەرەکی خۆم بووم چونکە. زۆر حەزم لە شیرەمەنی و خواردنی چەور دەکردو نەم دەتوانی خۆم بەرانبەری رابگرم و خێزانەکەم ماندوو دەکردتا ئامادەی دەکرد .

بەڵام پاش ئامۆژگاری یەکانی ‹لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی› بڕیارم داکە لەم قەڵەوی یە خۆم ڕزگار بکەم و هەرگیز خواردنی زۆرو چەورو شیرەمەنی نەخۆم و قایل بیم بەوەی لەسەر مێزی خواردن دابنرێت . خێزانەکەم زۆر ژیر بوو . . یارمەتی دام کە یەك جۆرە خواردن بۆ هەموو ژەمێك ئامادە بکات بۆم و ئەم شێوازە لەناو ئەو خێزانانەدا باوە کە ژیانیان ئاسایی و مام ناوەندی یە ، ئەوە دەگەیەنێت کە باشترین شێوەیە بۆ کەم کردنەوەی قورسایی مرۆڤ .

هەروەها خاوەنی لێکۆڵینەوەکە دەڵێت .

هێمنی و سەبرکردن زۆر گرنگە بۆ ئەوەی بە ئاواتت بگەیت و وەرزشکاری بکەو بە پێپلیکەکان دا سەر بکەوەو ئەسانسێر بەکارمە هێنە .

خوشکی بەرێز :

ئێستاش پرۆگرامێکی تایبەتی پیشانت دەدەین بۆ ئەوەی یارمەتی مێردەکەت بدەیت و سەلامەتی و تەندروستی بپارێزێت .

- نانی ناشتا -

یەك کوپ ئاوی میوە بەبێ شەکر ، یەك فنجان قاوە ئەگەر هاتوو هەستی بە برسیەتی کرد ئەوە یەك هێلکەی نیوە برژاوی بدەیە .

- نیوە شەو -

یەك پارچە پەنێر بەبێ ڕون

- ژەمی نیوەڕۆ -

پارچە مریشکێك لەگەڵ هەندێك گێزەرو پیازدا پێش نووستن :

یەك کاسە ماست ، سێ جار لە هەفتەیەك دا پێویستە بخورێت .

تێبینی

پێویستە هەر نیو سەعاتێك یەك پەرداخ ئاو بخویتەوە ، هەروەها پێویستە خۆت پیشانی پزیشك بدەیت .

لەم حاڵەتەدا چونکە لەوانەیە تووشی کەم بوونی ڤیتامین بێت .

● زینب حسین ●

# دگەل
# هونەرمەندێ گەنج
# وعد عزیز ئاکرەیی



لڤێ هاڤینێ ولـدهـوکـا داسینـا جەمـاوەری‌و رەوشـەنبیـرا حەژیکـەرێـت هونەرێ تەشکیلی ژڤـان هەبـوو دگـەل هونـەرمـەنـد (وعدعزیز ئاکرەی) دا پیشانگەهەکا قەشـەنـك ڤەکـەت . . ئـو هوسانێ لهـەیڤا تەباخێ‌و بو ماوەی حەفتیەکێ جەماوەر دچونە پێش پیشانگەها کاك وعـدی ڤێجـا ژبـەر جوانی‌و خەمـلا پێشـانگـەهـا کاك وەعدو بهەلکەفتنا ڤەکـرنـا پیشانگەها سێ یاوەعدی. مەبفـەر زانی کوڤێ چاپێکەتنی دگەل بکەین بو گوڤارا رەنگاو رەنگ گوڤارا هونـەرمـەنـدا «رەنگین»ونهـو دگەل کاك وعدو چەند پسارێت خارێ

● کاك وعـد خو بدە نیـاسیـن بو خویندڤانێت گوڤارا رەنگین؟!

= ناڤێ من وعـد عزیز شریف لسالا ١٩٦٥لبـاژیـرێ ئاکرێ ژبنەمالەکا رەوشـەنبیر هاتیمە دونیایێ دەرچویێ ئامـادەیا ئاموژگاریا ئیداری مە پشکا هژمـارتنێ سالا ١٩٨٤- ١٩٨٥ ل میـل ونهو ئەز هوش نڤیـسم لئاکرێ . .

● پیجـەك بومـە لسـەر ژیـانـا خویا هونەری باخڤە؟!

= ب راستی من هونـەر نەخـانـدیـە ئانـژیـك ئەز نەچـویمـە چ خانـد گەهـێـت هونـە ری . . بـەلێ هەر ژبـچیـکیـا خو من گەلـەك حەژ هونـەری دکـر . سەیـدایـێ من لخـاندنگەهێ لئاکرێ گەلەك کەیف بمـن دهـات و هەردەم دەسـتـێ هاریکـارێ بو من درێـژدکـر ئەڤـە ژلایـەکی‌و ژلایێ دیڤـە بابێ من و هەمی خەلکێ مالامە گەلـەك دەور هەبوو هەردەم تە شجیعا من دکر . . بێ گومـان من ژی گەلـەك عەشق وئـەڤینی دگـەل هونـەرێ تەشکیلی هیوو لچونێت من بو میسل دا چەند پەرتـوکێت هونـەری کرم ولمال من دخـاند دا رێکێت ڤی هونەری بزانم هوسا من هونەری تەشکیلی خاند

● ئەرێ خاندا هونەری فەرە ئان نەء؟!

= بەلـێ گەلـەك . . وەکـی مروڤ مالـەکێ خانیـەکی ئاڤا دکەت دڤێت بنیـاتی بەری هەمیا دانی‌و قایم کەی وهـەکـە بنیـات نەبیت ئەو خانی دێ زوی هەرفیت کەڤیت . . هونەر ژی وەسـایـە چەچ بیت موسیقی بیت شانـوگـەری بیت تەشکیلی بیت ئەو کەسێ دبیتـە هونەرمەند دڤێت بەری هەمیـا ئەو بزانیـت رێـکـێـت ڤی هونـەری چنـەو نجـوینیت و شروڤە کەت خانـدن زادێ هونـەرمـەندیەو هوسا دێ سـەرکەڤیت .

● تو حەژ چرەنگ دگەی؟!

= ب راستی هونـەرمـەنـد بێ پێتقی هەمی رەنگـایـەو هەمی رەنـگ من دڤـین بەلێ ئەز گەلـەك حەژ رەنگێ شین و کەسکی دکەم.







●چەند پیشانگەهێت هونەری تە ڤەکرینە؟!

= من دوو پیشانگە یێت تایبەت یێت ڤەکـریـن سالا ١٩٨٦ - ١٩٨٧ لئـاکـرێ و ئەڤـە یاسێ یەو ژبلی پشکـدار یێت من دپیشـانگـە هێت هەڤینـك دا وپیشـانگـەهێت مللی‌و نیشتمـانی دیسـا من پشکداریا کری دهەمی پیشانکەهێت وەزارەتا پەروەردەی .

●کیش خانـدگەها هونەری بهزراتە یاباشەو بوچی؟!

ب راستی . ئـەز گەلـەکێ داخبـارم ب خاندگەها سـریالی چنکی مروڤ

پێ ئازایەو خوشیا خو وەردگریت و ئەو تشتی مروڤی بڤێت دیارکەت دڤێ خاندگەهێ دا دیاردبیت. وهەردەم ئەس هەول دەم دکەڤالێت خودا کو بینەر تێبگەهێت کا ئەو چیە چ هزرە.. دەمێ ئەس وێنەکی دکەڤالێ خودا چێکەم ئەز دزانم من چ چێکر بەلێ بینەر بەلکی تێنەگەهیت ڤێجا لەوا ئەز حەش سریالیێ دکەم چنکی مروڤی رازی دکەت

● توبکێ داخباری ژهونەرمەندێت عیراقی و بیانی؟!

= ژهونەرمەندێت عیراق محمد عارف و فائق حسن ژبیانیا لیوناردو دافنشی و بیکاسو.

● هونەرمەند چیە؟!

هونەرمەند تودیکا مللەتیە هزرو بیرێت مللەتایە کەیف و خوشیا گەلێ خونە هەمی تشتا دگوهریت چ بخوشی ئان نەخوشی مومکە خو دسوژیت هەر ئێك ژلایێ خو ولدیف شیانا خو..؟!

● تەچ دڤێت ونەڤێت

=من دڤێت ژیانەکا سەربلنداهی و من نەڤێت بن دەستی.

● تەچ حەز هەیە؟!

= موسیقی و قەهاندنا هوزانێت کوردی.

● ئێکەمین کەفال؟!

=شارێ ئاکرێ و دیمەنێ سپەی و لڤێرە ئەز بخو حەسیام کو ئەز بدرستی گەهشتمە مرادا خو.

● تە ژن ئینایە؟!

= نەخێ.

● چ هیڤی و ئومێدتە هەنە؟!




= هیڤی و ئومێدا من ئەوە کو جەماوەر ژمن رازی بیت و بگەهەمە رێزا هونەرمەندێ هێژا محمد عارف.

●پەیڤا دیماهیێ؟!

= ئەز گەلەك سوپاسیا دەستەکا رێڤەبەرا گوڤارا هەژی رەنگین دکەم کو دەرفەت دایە من بو ڤێ چاڤێکەتنێ وهیڤیا سەرکەفتنێ و پێشڤەچونێ بو هەمی هونەرمەندێت کورد دکەم و من تیپینیەك یاهەی ئەو ژی ئەڤەیە بوچی گوڤارا رەنگین و روژناما هاوکاری ناگەهنە ئاکرێ و ئەم گەلەك زەحمەتێ دبینین هەتا ژمارەکا گوڤارا رەنگین بدەست مە دکەڤیت و جارەکادی ئەز سوپاسیا هەوە دکەم.

لدیماهیێ ئەم ژی سوپاسیا کاك وعد عقراوی دکەین وهیڤیا سەرکەفتنێ بو دکەین دژیانا وی‌دا.

●احسان صدیق ●



کاك شەماڵ لە نواندنی تەلەفزیۆنی (گوڵاڵە)دا

# ئەکتەرە کوردەکان

## شەماڵی عەبە ڕەش

لە دوایین ساڵەکانی دوومین قۆناغی بزوتنەوە شانۆییەکەمان دا واتە کۆتایی شەستەکان، ئەو دەمەی بێ دەنگیو نەبوونی بەرهەمی شانۆیی بینەرانی خستبووە حاڵەتێکی چاوەڕوانی چەند ساڵ خایەن، لەو کاتە ناسکەدا، دەستەیەك لاوی خاوەن بەخشش و هونەرمەند چرای شانۆکانیان هەڵکردو بە بەرهەمی بەپێزی ڕەنگین، خۆشهاتنەوەیان لە شانۆی کوردیو بینەرانی کردەوە. .

دیارترین لاوانی هونەرمەندی ئەو دەمەی سلێمانی تیپێکی بچووکی هیوا گەورەیان بەناوی (تیپی نواندنی سۆران)ەوە دامەزراند، دەرکەوتووترین کادیری ئەم تیپەش کاك شەماڵ عەبدوڵڵا ڕەشی سەرۆکی تیپی بوو. یەکەم دەرکەوتنی شەماڵ بەهۆی بەرهەمی ئەم تیپەوە بوو، بەڵام باشترین نواندنی ئەو دەمەی لە شانۆگەری (کاتێ خونچە ئەبێ بەگوڵ)ی تیپی سۆران دا بوو. هەر لەم ماوەیەدا بەرهەمێکی شانۆگەریی گەورەترین سەرکەوتنی بەنسیب بووئەویش (هاملێت)بوو لە دەرهێنانی خاڵە حەمە فەروج، یەکێك بوو لە بەرهەمەکانی تیپی قوتابیان و کاك شەماڵی عەبە ڕەش سەرکەوتوانەو داهێنەرانە کاراکتەری «هاملێت»ی نواند.

ئیتر شەماڵ چووە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغداو بە درێژایی پێنج ساڵەکەی خوێندنی ئەکتەر بوو لە دەیان شانۆگەریدا ، دیارترینیان:

(سمك عسير الهضم )و (محاكمة الرجل المجهول)و (ابوذر الغفاري)بوو. هەر لەو ساڵانەدا کاك شەماڵ میوانی ڕەزا - یرینی ئەو بەرهەمە تەلەفزیۆنیانە بووکە تیپەکانی سلێمانی ئەیانبردنە بەغدا بۆ تۆمار کردن، لەوانەش کە ئەم ئەکتەرە بە نواندنی کاراکتەری کۆمبارسی بەشداریی کردن: (کێچ)و (چەخماخە)و (لانەوازان). ساڵی ١٩٧٤ بووەتە ئەندامی تیپی پێشڕەوی شانۆی کوردیو لە شانۆگەریی (پردی وڵات)ی مامۆستا ئەحمەد ساڵاردا دوو دەوری سەرەکیی بە توانایە کی باشەوە یاری کردەوە. دوای تەواوکردنی پەیمانگا لە حەفتاو شەشدا بووەتە ئەندامی کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردی جاران و کۆمەڵی هونەرە جوانەکانی کوردی ئێستا، هەمیشە ئەندامێکی چالاك و بیر ڕوناك و دڵسۆزی کۆمەڵ بووەو تا ئەمڕۆش بە یەکێك لە هەرە ئەکتەرە هەڵکەوتوو دیارەکانی کۆمەڵ



هونەرمەند شەماڵی عەبە ڕەش



سەلەی نانکەر



گالیلۆ

بینراوە، هەر چۆن ئەکتەرێکی هەرە دیاری بزوتنەوە شانۆیی‌یەکەشمانە.. شەمالی هونەرمەند ، لە دیارترین بەرهەمەکانی کۆمەڵەدا لە ساڵانی ١٩٧٧ تائەمرۆ بەشدار بووە، بێجگە لەوەی دەرهێنەری هەر سێ بەرهەمی: قایل بوون، شەوکەت ناگەڕێتەوە، گوڵاڵە بووە، ئەکتەری سەرکەوتووی ئەم شانۆگەریانەش بووە:

- کاروانی خەبات ،ساڵی ١٩٧٧ ، کاراکتەری لاوێك.
- دیوار، ساڵی ١٩٧٧ ، کاراکتەری ئەفسەر
- سەلەی نانکەر، ساڵی ١٩٨٣ ، حەین.
- میراتی ، ساڵی ١٩٨٣ ، باوکی شیرین.
- کابرا سەیرەکە، ساڵی ١٩٨٥ ، ئەحمەد.
- گالیلۆ، ساڵی ١٩٨٨ ، گالیلۆ
- گەلەگورگ، ساڵی ١٩٨٨ بارام

وەکو میوانیش لەگەڵ چەند تیپێك دا بەشدار بووە ، وەك تیپی مەشخەڵی کەرکووك : شانوگەرێی کۆتایی دەربەگ، چالاکی قوتابخانەکان : پەیکەرو ئەنتیگۆنا، ڕۆشنبیری جەماوەر: پەروانە، تیپی نواندنی سلێمانی : جوولەکەکەی ماڵتەو سیناى ناسنین.

ئەوەی هونەرمەندان و بینەران لەو نواندنانەی کاك شەماڵ دا هەستیان پێ کردووە ئەویە کە ئەم ئەکتەرە لە باریدایە کاراکتەری جیا جیا لە یەك پێشکەش بکات ،جیاواز لە مەوداکانی نواندن و پێکهاتدن و خوڵقاندن دا هەروەها ئەوەشی لێ بینراوە کە لە تێکستە جیهانی‌یە باش دارێژراوەکاندا کە کاراکتەرەکانیان بە سەلیقەی هونەرمەندانەوە بنیات نراون نواندنی هەڵکەوتووی پێشکەش کردووەو بە ئەمانەتەوە ئەو کاراکتەرانەی گەیاندووە، لەوانەش: ئەحمەدی پارێزەر لە کابرا سەیرەکەی نازم حیکمەت داو گالیلۆ لە گالیلۆی برێخت داو باراباس لە جوولەکەکەی ماڵتەی مارلۆدا ... کاتی خۆی دەربارەی نواندنی شەماڵ لە «جوولەکەکە ی ماڵتە »دا نووسیمان:

[باراباس هونەرمەندی ناسراو شەماڵ عەبدوڵلا ڕەش بوو، ئەم شەخسیەتە بڕبڕەی پشتی شانوگەری یەکەیە، شەماڵ زیرەکانە مەودای دەورەکەی بۆ خۆی لێك دابووەوە، چالاکانە دەورەکەی نیشانداو توانی بیسەلمێنێ کە ئەکتەرێکی پایەبەرزەو لەنێو نواندن و شانۆی کوردیمان دا خاوەنی شوێنی تایبەتی خۆیەتی....] هاوکاری ١٩٨٠/٢/٤.

بە هەمان شێوەش، لە نواندنی شانوگەری‌یە کوردی‌و ئامادەکراوەکان دا بەهۆی دەنگی لەباری‌و توانای گۆڕینی تۆنە دەنگی‌یەکانی‌یەوەو بەیارمەتی لەشی لەبارو دەستەڵاتدار بەسەر جوڵانەوەکانی‌دا سەرکەوتنی نایابی وەدەست هێناوە، لەوانەش دەورەکانی: حەین لە سەلەی نانکەرداو باوکی شیرین لە میراتی‌داو باران لە گەلە گورگ دا. هەروەها هەردوو کاراکتەری یۆسو ئاسکەو پشکۆ لە هەردوو زنجیرەی تەلەفزیونی خاتوو کلاوزەرو گوڵاڵەشدا.

جێگای ئاماژە بۆ کردنیشە ئەم ئەکتەرەمان خاوەنی دەنگێکی خۆشەو دەنگخۆشی‌یەکەشی بۆ چەند کارێکی درامی بەکارهێناوە، ئەوەبوو لە «ژیان»ی تەلەفزیونداو «گەڕانەوەیەکی کتوپڕ»ی شانۆدا بەوتنی چەند ئاوازێك دەنگی شەماڵ ئیزافەی کردە سەر بەرهەمەکان. هەروەها ئەم هونەرمەندە کاتێك بەشداری‌یەکی ئەبێت لە شانوگەری‌یەکەدا هەموو کاتی خۆی دڵسۆزانە تەرخان ئەکات بۆ ئەو شانوگەری‌یەو بە ئیلیتزامێکی تەواوەوە کار ئەکات و ڕەوشتی هونەرمەندی ڕاستەقینەی هەمیشە لێ‌بینراوە ، شایانی باسیشە هەر چۆن وتراوە (ڕێکەوت دەوری خۆی ئەبینێ)ڕێکەوتیش بۆ شەماڵ خوڵقاو هاوسەرەکەی (خاتوو شادان فوئاد)ی هونەرمەندی شانۆیە.

●یاسین قادر بەرزنجی●

# که وێنه بۆ مێژوومان ئەگێڕێتەوە

وێنەی ماموستایانی قوتابخانەی [نموونەی سەعادەت ـ بەشی سەرەتایی] لە سلێمانی. سالی ١٩٢١ وەرگیراوە. دیاری گوڤاری [بلێسە]ی سالی ١٩٥٩ بوە. ئێمە بە لێکولینەوەوە٭ بلاومان کردەوە:

لە راستەوە بۆ چەپ [خوالی خوشبوان]: زێوەر [عبد الله محمد ١٨٧٥ ـ ١٩٤٨] سەعید صدقی کابان [١٨٨٦ ـ ١٩٦١] خواجە ئەفەندی [١٨٤١ ـ ١٩٤٢] رەشید زەکی کابان [١٨٧٦ ـ ١٩٤٠] عبد الله صبری. عبد الرحمان نەسیب [١٨٨٣ ـ ١٩٧١] ئەحمەدی عەزیز ئاغا [١٨٩٤ ـ ١٩٦٩].



# بەئیمزاکەت



# خۆت بناسە



سەرناسی رەنگین



● جمهوری سلیمان احمد ـ میرگەسور، حەزلە سەروەت و مالی دنیائەکەیت ونازانی چۆنی پەیدا بکەیت.



● سلیمان محمد حسن ـ صلاح الدین، دلت پاکە، هەموو کەست خۆش ئەوێ، سادەیت.



● بکر محمد أمین ـ قوشتەپە، حەزت لە هونەرە، لاسایی خەلکی ئەکەیتەوە، دل غەمگینی گوێ مەدەری خوا کەریمە..



● عبداللەعلی قادر ـ دهوك. دریژەبە هەمووشت ئەدەیت و حەز ئەکەیت هەموو شتێك بەدلی خۆت بێ.



● رباح ناصر صادق ، زاخو، ئەمەکەی ئیمزایە، ئەلیی رەسمی پیچ پیچەکانی ریگای زاخۆت کردووە.



● نامق پەروش ـ صمود ، خۆت بەشتی لابەلاییەوە خەریك مەکە، هەول بدەبەریگای چاکە بگەیتە ئەنجام.



● رشید خلیل شیروانی ـ حەریر، سەرت لەخۆت و خەلکەکەش تیك داوە، ئەوەندە ئالۆزی کەس لیت نێ ناگات، لەسەرخۆبە ـ



● سەروەر ئەنوەر رەنجەرو ـ تکریت، تۆپاشە رۆژیکی باشت هەیە، بەلام لەگەر هەول نەدەی ،ئەوارەنجەروتر ئەبی...!!



● فرحان ابراهیم عبدالله ـ هەولیر ، سادەو بێ هەواو فیزی دل فراوان سەخی تەبیعەتی.



● نجاة مصطفی رۆستایی ـ دیانە ئەفس بەرزی لێ هاتووی تۆزی لەسەرخۆبە، ئەگەیتە ئەنجام.



● حەکیم حەمید ئەحمەد ـ هەولیر ،کولیجی ئاداب ، کاك حەکیم خۆت لەخەلکی ئەگۆری و ناونیشانی تەواو ناتووسی واتەزانی نایزانین ، بە ئیمزاکە تادیارە هەمووشتت شاراوەیە.



● سرود عبدالامیر حنا کویە. تۆزۆر رارایت، ئیمزاکەت زوو زوو ئەگۆرێ پەلەمەکە. شت تیکەلاومەکە.



● دارا علی عبدالرحمن ـ بەغداد ، تۆهێشتا مندالی ، زیرەکیت تیایە خەریکی خویندنەکەت بە پاشە رۆژت باش ئەبێ..



● نازەنین محمد أمین ـ سلیمانی، حەزت لەسپۆرتی و ریك وپیکیە، بەلام تۆزێ پەلەتە..



● عمر حسن احمد ـ کەلار، خۆت مەشغول مەکە، دریژەبە شت مەدە، دل ساف و سادەبە باشترە لەم وەزعەی ئیستات.



● نجم الدین خلیل کریم ـ کەرکوك ، تۆواقیعیت، بەلام تۆزێ بیرت بلاوە، تۆرەییش باش نییە خۆت لێ لادە..

ئیمزا



ناو: دانا

ناونیشان:






لەم رۆژانەدا گەشتێکم کرد بەناو ئەو برا بەرێزانەدا کە زۆر بەدڵسۆزی یەوە باوەشی گەرمیان کردووە بەکتێبی کوردی‌داو دەیکڕن و دەیفرۆشن.. من خۆم گەلێ جار کتێبی وام دەس کەوتووە لە لایان چەند ساڵ بۆی گەڕاوم.. شایانی باسە گەشتەکەم تەنها کتێب فرۆشی سەر شەقامەکانی گرتەوەو هەرچونی بێ چاومان بەو برایانەکەوت و بەم جۆرە کەوتینە پرسیارو وەڵام......ـ

سەرەتا چاومان بە مەحموود خاکی کەوت و لە بارەی رۆژنامەو گۆڤارو کتێبەوە کەوتینە قسەو گوتی: لەساڵی ١٩٤٨وە من رۆژنامەو کتێب دەفرۆشم.. سەرەتا هەر رۆژنامەی ژین هەبوو جارجار رۆژنامەی عەرەبیم لە ماموستا نجم الدین مەلا وەردەگرت و دەمفرۆشت و وردە وردە گۆڤاری ـ نزار ـ و ـ گەلاوێژ ـ و کتێبی ترم دەفرۆشت.... سەبارەت بەوەی ئەوسا چاپەمەنی چۆن دەفرۆشراو چەندی دەفرۆشت وتی: بەدەس بەناو شەقام و چایخانەو بازارو شوێنە گشتی یەکاندا دەگێراو لەمانگێکدا ـ ٣٠ ـ ژمارە گەلاوێژم وەردەگرت ـ ١٢ ـ دانەی دەمایەوە هەروەها رۆژنامەو گۆڤارەکانی دیش بەتەواوی نەدەفرۆشران... خوێندەواری ئەوسا زۆر کەم بوون.. شایانی باسە زۆرترین ژمارەم لەشەقامی سابونکەران دەفرۆشت چونکە چاپخانەی پیرەمێردی لێ‌بوو لەبەر ئەوە لەوێ زۆر دەفرۆشرا.. ئەنجا وتی: جگە لە کتێب ورۆژنامە فرۆشتن من تا ئێستا کە ـ ١٠ ـ دە کتێبم لەسەر ئەرکی خۆم لە چاپ داوە دڵم زۆر خۆشە چونکە توانیومە لەو رێگایەوە خزمەتی نەتەوەکەم بکەم. هەروەها لەبارەی پرسیارێکەوە سەبارەت بە کتێب و چاپەمەنی یەکانی دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی وتی: بەگشتی چاپەمەنی یەکانی دەزگا لە لایەنی هونەری یەوە زۆر سەرکەوتووەو لەلایەنی ناوەرۆك و بابەتیشەوە زۆر بەتام و بەپێزەو ئەگەر بمدەنێ من تەنها خۆم ـ ٥٠٠ ـ پێنج سەد دانە لە گۆڤاری رەنگین دەفرۆشم بێجگە لە بەیان و رۆشنبیری نوێ بەلام داخەکەم ـ ٥٠٠ ـ دانەم بەرناکەوێ و تەنها ـ ١٥٠ـ دانەم دەدەنێ هیوادارم زیادکەن..





لەمەودوا ئەو ژمارەیەم بۆ لەبارەی خۆشترین رۆژانی کتێب









فرۆشتنی‌یەوە گوتی خۆشترین رۆژم ئەو رۆژنـانە بووە کە کتێب و گۆڤارو رۆژنامەم تیادا زۆر فرۆشتوە لەبیرمە رۆژی نەورۆزی سالـی - ١٩٥٤ - سێ‌سەد - ٣٠٠ - دانەم لەرۆژنامەی ژین فرۆشت . . شایـانی باسـە ئەو ژمـارەیـە نرخـەکەی لەجاران گرانتر بوو کاغەزەکەشی سپی بوو.

ئەوەش بڵێـم هەر لەبیـرمـە خاڵـە پیـرەمێـرد لە سالـی - ١٩٥٠ - دا بەنـەخۆشی شیعری - ئەم رۆژی ساڵی‌تازەیە - ی خوێندەوە دەربارەی ناخـۆشترین شت لە ژیـانی کتێب فرۆشتنی‌داوتی: ناخـۆشتـرین شت ئەوە بوو لە سەعـات ١٠ی سەر لەبـەیـانـی رۆژی هەیـنـی ١٨/١٠/١٩٥٧دا کتێبەکانم لەپاڵ دیـواری بەریـدا کە ئێستـا کتێبی لێ دەفـرۆشین رێك و پێك ریز کردبوو هەر ئەوەنـدەم زانی لافـاو هەڵسـاو شاری سلێمـانی‌و کتێبـەکانی منیشی ڕامـاڵی‌و لەشـە پۆلـەکـانی‌دا لوولی کرد . . دەربارەی کۆنترین کتێب کە لەلای هەبێ وتـی: گەلـێ کتێبـم لەلایـە لەوانـە - مختصری صرف و نحـوی کوردی - سعیـد صدقی - سالـی ١٩٢٨ چاپ کراوەو - ٧٦ - لاپـەرەیـەو لەچـاپخـانـەی نەجـاح لەبەغدا چاپ کراوە . . . هەروەها کتێبی - قرآت - سالی ١٩٣٢ چاپ کـراوەو - توتـنـەکـەمـان - ١٩٣٥لەچاپ دراوەو

دەربـارەی هەنـدێ یادگـاری کتێب فرۆشـتـنـیش گوتـی: لە یادمـە لەچـایخـانـەکەی عەبەپاشا کەئێستا بووە بە سەمـونخـانـە مامۆستا محرم محمـد ئەمین دانیشتبـو منیش خۆم کرد بەژووورداو باوەشێ کتێبی گۆمی شڵەقاوی محرمم پێ‌بوو هاوارم کرد گۆمی شڵەقاو دانەی بە - ٦٠ - فلس مامۆستا محرم زۆری پێ خۆش بوو دانیشـاندم و چایە کیشی بۆ کریم و هەتـا چاکەم تەواو کرد سێ دانەم لێ فرۆشـت . . سـالـی ١٩٥٦ لالـوکـەریمی مامـۆستـا نەبـەزم دەفرۆشت خەڵك دەیانوت گرانە . . ئەی دەبێ ئێستا چی بڵێن . . !

شایـانی باسـە مەحمود خاکی هەتا ئێـتا هەر لە سەر شەقامەکاندا کتێب دەفـرۆشێ‌و وەکـو خۆی وتی گەلێ کتێبی کۆنی لەلایەو چاکتریان بەلای منـەوە کتێبێکی عەرەبی بو بەنـاوی - تأریـخ الالویة العراقیة - لەو کتێبەدا بەتێرو تەسەلی باسی ئەو سەردەمەی سلێمانی کراوە . . .

ئەنجـا چاومـان بەکـاك نەبـەز قادر کەوت و لێـمـان پرسـی: بۆچـی گۆڤاری رەنگین نافرۆشی . . . ؟

لەوەڵامـدا گوتـی: لەراستـی‌دا زۆربەی خوێنەران هەواڵی گۆڤاری رەنـگـین دەپـرسـن و بەدوایـدا دەگـەرێن. بەڵام من لەدەدوانزە دانە زیاترم لە کتێبخانە کان دەستاکەوێ‌و ئەوەش دەسـبـەجـێ تەواو

دەبێ . . بـەڵام ژمـارە کۆنـەکـانی بەیان و رۆشنبیری نوێ‌و رەنگینیش لەو کەسـانـە دەکـرمـەوە کەدوای خوێـنـدنـەوەیـان دەیـان فرۆشنـەوە . . . لـەم لایـەنـەوە کریـاری ئەو ژمـارە کۆنـانـەی ئەو

گۆڤـارانـە زۆرن ئەنجـا وتی: وەکو دەبـینی کتێبی کۆنیش دەفـرۆشم و نرخی کتێش بەپێی تازەیی‌و کۆنی‌و قەبـارەو ناوەرۆکـی ئەو کتێـبـە دەگۆڕێ‌و نەکتێب و نەگۆڤاری کۆن لەلای ئێمـە نرخێکی دیاری کراوی



نیە دوای ئەو چاوپێکەوتنانە بە کاک ئەبوبەکر محمد شریف کەوت کە ئەمیش کتێب فرۆشێکی لاوە لەبارەی کرینی کتێب و رۆژنامەو گۆڤاری کۆن و نوێو فرۆشتنیانەوە . وتی : من لە ساڵی ١٩٨٢ کتێب وگۆڤاری کۆن و نوێ دەفرۆشم چاپەمەنی یەکانی دەزگای رۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی - بەیان - و - رۆشنبیری ی نوێ - و- رەنگین - گەلێ کتێبیش کەبەشی خۆمان وەردەگرین لە ماوەیەکی زۆر کەمدا تەواو دەبێو گەلێ جارناچارین برۆین لەبەغدا یا لە هەولێر ژمێکی تر بێنین . .

لەراستیشدا خەڵك زیاتر رەنگین دەکرێ چونکە هەمە رەنگەو بابەتەکانی بەدڵی خەڵکە . .

لەبارەی فرۆشتنی کتێبیشەوە وتی : زیاتر کتێبی کۆن کریاری زۆرە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رۆمان و کورتە چیرۆك باش سەرف دەبێ . . بۆ نموونە هەرچیمان لە رۆمانی - شار - ی حوسێن عارف هانی لەماوەی تەنها یەك رۆژدا فرۆشتمان و کۆمەڵێ دیمان هێناو ئەویش هەر تەواو بوو . . بەڵام بەراستی کتێبە کۆنەکان گەلێکیان کریاریان زۆرن و بەنرخی گران دەیان کرین و بەگرانتر دەیانفرۆشینەوە . . بۆ نموونە دیوانی - نالی بەحەوت هەشت دینار دەکرین و دەیدەین بە نۆیان دە دینارو کریاریشی هەیە

هەروەها چاومان بە برای کتێب فرۆش کاك سابیر حسین معروف کەوت و گوتی : من لە ساڵی ١٩٧٩وە کتێب ئەفرۆشم و زیاتر دیوانی شاعیرە کۆنەکان و رۆمان و کتێبی مێژوویی چیرۆك دەفرۆشم . . جگە لەوەش گۆڤاری کۆن و نوێ دەکرین و دەفرۆشین رەنگین لە گۆڤارەکانی تر کریاری زۆرترە . . ئەبێ ئەوەشم لە بیرنەچێ کە ئەو پێشانگایانەی کە دەزگای ناوبراو بۆ کتێب دەیان کاتەوەو کتێب بەنرخی داشکاو بەهاو - ولاتیان دەفرۆشی کەڵکی زۆرەو والە گەلێ خوێنەر دەکا کتێب بکرێ . . چونکە گەلێ کەس کەحەزیان لەکتێبەو لەبەرگرانی ناتوانی کتێب بکرێ . . . بەڵام بەنرخی داشکاو دەتوانێ بیکرێ . . و سوودی لێ ببینێ . .

ئەنجا وتی : دیوانی گۆران لە هەمو کتێبێ زیاتر فرۆشرا . . چەندم دەهێنانەدەمایەوە . . هەندێ برادەر هەن گلەیی ئەوە دەکەن کە هەندێ کتێبی کۆن بەگران دەفرۆشین لەم رووەوە ئێمە هیچمان بەدەس نیە چونکە ئەوانەی ئەو کتێبانەمان پێ دەفرۆشن داوای نرخی زۆردەکەن . . ئێمەش کە بەگران بیکرین بەگرانتر دەیفرۆشینەوە . . چونکە ژیانەکەمان لەسەر کتێب فرۆشتنە . .

سەبارەت بەگۆڤاری رەنگین وتی : گۆڤارێکی سەرکەوتووەو کریاری زۆرەو گەلێ بابەتی هەمە جۆری تیایە سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ . . حەزیش دەکەم گۆشەیەکی تایبەتی تیادا بکرێتەوە بۆ بایەخ دان بە ئەدەبی منال . . .

پرسیارێکی دیمان دەربارەی کۆنترین کتێب کەفرۆشتبێتی ئاراستە کردو لەوەڵامدا گوتی : کۆنترین کتێب کەلێرەدا فرۆشتبێتم کتێبێکی - مختصری صرف و نحوی کوردی مامۆستا سعید صدقی کابان بوو . . هەندێ جاریش ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژو هیوا دەفرۆشین سەبارەت پیشەی کتێب فرۆشتن وتی : کەڤوتابی بووم لەپشووەکاندا ئەم ئیشەم دەکرد و ئێستاش بووەتە بەشێك لەژیانم و رێزی بێ پایانم هەیە بۆ ئەو برادەرانەی کتێبمان پێ دەفرۆشن و کتێبمان لێ دەکرن . .

ئەم برایەمان بەجێهێشت و ئەنجا روومان کردە برای کتێب فرۆشمان کاك هاوبیر ئەنوەر برزۆو کەوتینە دەمەتەقێ دەربارەی کتێب و گۆڤارو چاپەمەنی کوردیو لەوەڵامی هەندێ پرسیاردا وتی : من لە ساڵی ١٩٨٢وە کتێب ئەفرۆشم و کتێب و گۆڤاری کۆن و نوێی عەرەبی کوردیم لەلا دەستدەکەوێ گەلێ کتێب کر هەن کتێبی دەگمەنمان لەلادەکرن . . شایانی باسە ئێمە زۆربەی چاپەمەنی یەکانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەفرۆشین و کریاریان زۆرە بەڵام خۆزگە نرخی هەندێ کتێب ئەوەندە گران نەدەبوو . . نرخی جارانیان زۆر باش بوو کەس گلەیی لی نەبوو

سەبارەت بەگۆڤارەکانی دەزگاش دەڵێم زۆربەی زۆری سەرف دەبن بەتایبەتی گۆڤاری رەنگین چونکە گۆڤارێکی هەمە چەشنەیەخو ئەگەر گۆشەیەکی بۆ منال بێو بایەخ بەئەدەبی بۆ منال تیا نووسراو بدات ئەوە چەند هەنگاوێکی دی دەچێتە پێشترەوە . . شایانی باسیشە هەتا ئێستا لە ماوەی کتێب فرۆشیمدا هیچ چاپکراوێکم نەدیوە ئەوەندەی گۆڤاری رەنگین کریاری هەبێ . .

دوای ئەوە روومان کردە کاك محمد عبدالرحمن کە ئەم برایە کتێب فرۆشەو کتێب فرۆشتنی کردوتە پیشە . . لە گەڵیدا کەوتینە پرسیارو وەڵام گوتی : من لە ساڵی ١٩٨٢وە کتێب دەفرۆشم . . وەك سەرنج دەدەم خەڵك واتە خوێنەران زیاتر بۆ کتێبی کۆن دەگەرێن . . کتێبە کانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی باش سەرف دەبێ بەڵام نرخی کتێبی ئەم دوایی یەیان گرانەو وەکو جاران کریاری نیە . . گۆڤاری رەنگینیش کریاری زۆرە بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم حەز دەکەم لەباتی هەندێ وێنە بایەخ بەئەدەبی منال بدرێو شتی وای تیا بڵاوبکرێتەوە منالانیش بیخوێننەوە . لە کۆتایی گەشتەکەماندا چاومان بەکوردەوان محمد سعید کەوت و گوتی : من لەساڵی ١٩٨٨وە کتێب ئەفرۆشم . . و وەکو بۆم دەرکەوتووە کتێبە کۆنەکان زیاتر ئەروا و هەندێ کەس بەپارەی زیاتر دەیکرن . لەکۆتاییشدا وتی من لەبێ ئیشیدا ئەم کارەم هەڵبژاردووە بەڵام کارێکی پیرۆزەو ئێستا زۆر حەزم لێیەو بەدڵخۆشی یەوە باوەشم بەم پیشەیەدا کردووە . .

ئێمەش سوپاسی خۆمان پێشکەش بەوانە دەکەین کەخزمەتی ئەولاپەرانە دەکەن و رێزی لێ دەگرن کە وشەی پیرۆزی کوردی تیادا نووسراوە . .

ئامادەکردنی
● لەتیف هەڵمەت ●



# سێ ئامۆژگاری بچوك

جاری وا هه‌یه مروڤ تووشی هه‌ستی خه‌یالاوی ئه‌بی هه‌ست به‌وه ئه‌کا که مروڤیکی نه‌خوشه ئه‌م خه‌یاله ئه‌دا له میشکی تووش وریته‌و ترس ئه‌کا . ئه‌م جوره نه‌خوشانه له سه‌ر رای خویان زور سوورده‌بن ناتوانی به ئاسانی وای لی بکه‌ی رای خوی بگوری هه‌روه‌ها ئه‌بینین تووشی گوشه‌گیری ئه‌بی‌و له خه‌لکه‌که دووره په‌ریز ده‌وه‌ستی که‌واته ده‌بی یارمه‌تی بدری بو ئه‌وه‌ی ئه‌م نه‌خوش یه‌ی کون ئه‌کا لی‌ی. چاره‌سه‌ریشی زور ئاسانه ئه‌ویش به گوریتی بارو دوخی ناو مال به‌ره‌و خوشی هه‌لسوکه‌وت بگوری . بوریته گه‌ران و میوانداری . سه‌فه‌ری له گه‌ل بکه‌یت بو ئه‌وه‌ی خوش و شادی بچیته دلی به‌وه هه‌روه‌ها بو شایی له‌ژیانی ئه‌مینی له روژگاری ژیانی به خه‌ریك کردنی به یاریو گالته‌و که‌پ . به‌م جوره له‌م نه‌خوش یه نیگه‌رانیه رزگاری ده‌بی جگه له‌وه ده‌بی دا یك ئاگاداری خواردنی بی وخوراکی برفیتامینی بدریتی که‌وا بو ته‌ندروستی باشه و له زور نه‌خوشی‌تر ده‌پاریزیت له‌مانه ش

●ڤیتامین A به‌رهه‌لست له‌ش زیاد ده‌کا له‌گه‌ل ئه‌وه‌شا پیسته‌ی له‌ش ئه‌پاریزی له نه‌خوشی‌و ره‌نگ و رووی مروڤ ئه‌گه‌شیته‌وه وه‌کو ئه‌لیین رومه‌تی ئه‌لی‌ی سیوه لاسوره‌یه چونکه ته‌ندروستی باشه . هه‌روه‌ها توانای بینینی چاوی زیاد ئه‌کا . ڤیتامین A دووجوری هه‌یه ئاژالی‌و رووه‌کی سه‌رچاوه کانیان ئه‌مانه‌ن

جگه‌ر.که‌ره‌په‌نیر.گورچیله، زه‌ردینه‌ی هیلکه

سه‌رچاوه رووه‌کیه‌کان :

گیزه‌ر.مه‌عده‌نوس.شویت بیبه‌ری سه‌وز.قه‌یسی.سپیناغ

ئاموژگاری سی‌یه‌م :-

چون سود له سیر وه‌رئه‌گری .

● سیر باشترین ده‌رمانه بو نه‌خوشی هه‌لامه‌ت ئه‌گه‌ر بیتو نه‌ختیکی لی ووردکه‌ی بیخه‌یته به‌ر لوتت هه‌ناسه‌یه‌کی قول بکیشی هه‌لامه‌ته‌که‌ت رائه‌وه‌ستی به‌چه‌ن جاریك به‌م کاره هه‌سته چاره‌سه‌ری ئه‌م نه‌خوشیه ئه‌که‌ی

## ● ئاموژگاریه‌کی بچوك

## ● بو ژانی کلاوی ئه‌ژنوو جمکه‌کانی له‌ش

نه‌ختیك سیری هه‌نجراو له‌گه‌ل کافور تیکه‌لاو بکه به مه‌رجیك سیره‌که دوو ئه‌وه‌نه‌ی کافوره‌که بی . دوای ئه‌وه‌ی که جوان تیکه‌لاوی ئه‌که‌ی وه‌ك کریمی لی دی ئه‌یخه‌یته سه‌ر ئه‌وشوینه‌ی ژان ئه‌کا به ئه‌رمی بیشیله به له‌فافیکی گه‌رم بیپیچه‌وه دوای ماوه‌یه‌کی که‌م ئه‌بینی ئازاره‌ی‌که‌ی تیا نامینی

● (٣٠)غم سیری هه‌نجراو بخه‌ره ناو شوشه‌یه‌کی سرکه داپوشه به گه‌رمی داینی له شوینیکی پاك بو ماوه‌ی ده روژ ده‌ستی لی مه‌ده دوای ئه‌وه ئه‌م ماده‌یه‌ی که پیك دی باشترین ده‌رمانه بو پاکردنه‌وه‌ی برین و شوینی پیوه‌دانی زینده‌وه‌ران [حشرات]

● گه‌لاویژ حسن ●



# گۆشەی یەکترناسین



ناو: كمال عمر حمه سعيد
ناونیشان: سلیمانی ، بازاری خەففاف، سەرتاشخانەی زاكروس
تەمەن: ٢٣سال
ئارەزوو: ژیانی هونەرمەندان



ناو: شیلان شریف رشید
ناونیشان: چم چمال ، سەرشەقام ٢/٥٧
تەمەن: ١٣ سال
ئارەزوو: خوێندنەوەو شیعرو دەنگی حسن زیرەك و نامە گۆڕینەوە



ناو: علی بی کەس
ناونیشان: كفری : ئامادەیی کەلاری پیشەیی بەشی بازرگانی
تەمەن: ١٩سال
ئارەزوو: خۆش نووسی ، نامە گۆڕینەوە، خوێندنەوەی گۆڤاری رەنگین



ناو: نضال حمید احمد
ناونیشان: موصل ، ص. ب ٤٦٨
تەمەن: ٢٩سال
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوە



ناو: زیدان باقی رشید
ناونیشان: موصل ـ حي الجزائر
تەمەن: ٢٢سال
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوە



ناو: ئازاد صدیق حمه
ناونیشان: کۆمەڵگای باینجان
تەمەن: ١٧سال
ئارەزوو: وەرزش و نامە گۆڕینەوە



ناو: دلفروز رەنجەرو
ناونیشان: هەولیر، ص. ب ١٠٦
تەمەن ٢٣سال
ئارەزوو: شیعرو وەرزش و نامە گۆرینەوە



ناو: فقی ابراهیم رسول
ناونیشان: كربلاء ـ مصنع تعليب كربلاء ، قسم النقليات
تەمەن: ٣٢ سال
ئارەزوو: شیعر دانان و نامە گۆڕینەوە



ناو: طارق خضر محمد
ناونیشان: كركوك ، گەڕەکی ئازادی ، ژمارەی دەرگا ١٩٤/٦
تەمەن: ٢١سال
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو وەرزش



ناو: شکر حمد قادر باجەلانی
ناونیشان: چوارقورنە، کۆمەڵگای حاجی ئاوا
تەمەن: ٢٢سال
ئارەزوو: شیعر خوێندنەوە



ناو: عارف ملا محمد نیرە گینی
ناونیشان: هەولیر ـ کۆمەڵگای قوش تەپە
تەمەن: ٢٥سال
ئارەزوو: گۆرانی و گەشت و گوزار



ناو: غەمبار محمد قەرەداغی
ناونیشان: کۆمەڵگای سەرکەوتن ـ کانی سارد ٧٠/٤٧
تەمەن: ١٧سال
ئارەزوو: شیعرو نامە گۆڕینەوە



ناو: نافع حمد أمین شیخانی
ناونیشان: هەولیر ـ کۆمەڵگای قوش تەپە
تەمەن: ١٨سال
ئارەزوو: وەرزش



ناو: کاوە تایەر توفیق
ناونیشان: کویسنجق ـ گەڕەکی شاخەمشکە
تەمەن: ١٦سال
ئارەزوو: دلداری و نامە گۆڕینەوە



ناو: صالح طالب حسن
ناونیشان: سلیمانی ـ کاریزە وشك
تەمەن: ١٨سال
ئارەزوو: خوێندنەوەی شیعر



ناو: محمد حسن عبدالكريم
ناونیشان: کەلاری کۆن
تەمەن: ٢١سال
ئارەزوو: شیعر خوێندنەوە

ناو: شیرکو احمد
ناونیشان: هەولیر ، گەڕەکی ئاشتی خانووە کۆنەکەی هونەرمەندی خوا لێ خۆشبوو تایەر توفیق
تەمەن: ٢٢سال
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو خوێندنەوەی گۆڤاری رەنگین



ناو: سوران رضا عزیز
ناونیشان: کۆمەڵگای سەرکەوتن ـ بانی خێلان
تەمەن: ٢٢سال
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو تۆپی پێ



ناو: کاظم حورشید حەمەکوڕ
تەمەن: ٢٣ ساڵ
ئارەزوو: هونەرو وێنەگرتن
ناونیشان: دیالی، كفري، خاوەنی ستۆدیۆی ( کواکب )



ناو: ئاواز حمه أمین
ناونیشان: دەربەندیخان، ئامادەیی پیشە سازی دەربەندیخان
تەمەن: ١٧سال
ئارەزوو: خوێندنەوەو گوێ گرتن لە ژیانی هونەرمەندان



نەوشیروان محمود حاجی قادر
تەمەن ١٢ ساڵ.
ئارەزوو: تۆپ تۆپێن ، زڕناودەهۆڵ
ناونیشان: قضاء کەلار



ناو: دلشاد محمد شریف هیدایت
ناونیشان: چم چماڵ ـ گەڕەکی مجمع
تەمەن: ١٤ساڵ
ئارەزوو: وەرزش وتوپی پێ



ناو: بیوار احمد
ناونیشان: دینە ـ گوندی دیمریان
تەمەن: ١٨ساڵ
ئارەزوو: شیعر نووسین



ناو: جرجیس محمد أمین بلباس
ناونیشـــان: موصـــل حي الكـــرامـة.
ژمارەی خانوو ١٣٦
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: توپی پێ. خوێندنەوە



ناو: حمید سماعیل رەسوڵ
ناونیشان: کویسنجق: گەڕەکی جمعیە
٢/٨٠٥ ٨٠٤
ئارەزوو: خوێندنەوەو یاری توپی
تەمەن: ٢٢ساڵ



ناو: خلیل مصطفی أحمد
ناونیشان: شەقلاوە، گەڕەکی ئازادی
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: وەرزش



ناو: زرار رمضان حسن چۆمانی
ناونیشان: کۆمەڵگای قوش تەپە
تەمەن: ١٧ساڵ
ئارەزوو: وەرزش و گۆرانی



ناو: حمید صالح رسول چومانی
ناونیشان: هەولیر ـ کومەلگای شاوەیس
تەمەن: ١٧ساڵ
ئارەزوو: وەرزش



ناو: حامد رشید شیوەرەشی
ناونیشان: ناحیەی خەبات
تەمەن: ٢٠ ساڵ
ئارەزوو: نامەگۆڕینەوە



ناو: کریم محمد امین رەمضان
ناونیشـــان: دوز خورماتو ـ گەڕەکی
کوماری
تەمەن: ١...
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو ...



ناو: دلـ کەسەر هەرکی
ناونیشان: هەولیر ـ ناحیەی خەبات
تەمەن: ١٨ساڵ
ئارەزوو: هونەر و خوش نووسین



ناو: مارف عزیز چۆمانی
ناونیشان: کۆمەڵگای حەریر
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: تەکنیـکـاروەنگی حسن زیرەك



ناو: نجم الدین رحیم عبدالله گلی
ناونیشـــان: دوز خورمـــاتـو ـ گەڕەکی
عەسکەری
تەمەن: ٢١ ساڵ
ئارەزوو: شیعرو نامە گۆڕینەوە



ناو: جبار یاسین محمد چۆمانی
ناونیشان: کۆمـەڵگـای کانی قرژاڵـە،
ص. ب ٢٧١
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو مۆسیقا



ناو: عبدالواحد محمد غریب
ناونیشان: کرکوك ـ شۆریجە
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: خۆش نووسیو یەکترناسین



ناو: خالد خورشید قادر
ناونیشـــان: هەولێـر ـ کۆمـەڵگـای بنە
صلاوە
تەمەن: ١٨ساڵ
ئارەزوو: توپی پێو نامە گۆڕینەوە



ناو: خیرالله رسول عمر
ناونیشان: جامعة بغداد ـ كلية الادارة
والاقتصاد ـ قسم المدرسين التجاريين
تەمەن: ٢١ساڵ
ئارەزوو: نامەگۆڕینەوەو خوێندنەوە



ناو: محمد قادر شێرخان
ناونیشـــان: کۆمـەڵگـای طاسلوجە،
سەرتاشخانەی بەمۆ
تەمەن: ٢١ساڵ
ئارەزوو: یاری توپیو دەنـگی حسن زیرەك



ناو: عدنان سید شوکر
ناونیشـــان: دوزخـورمـاتـو، گەڕەکی
جوانان
تەمەن: ٢٠ساڵ
ئارەزوو: کارکردن



ناو: شێرزاد سعید فتاح
ناونیشان: کرکوك ـ رحیم ئاوە ـ أسواق
ابو أشور
تەمەن: ٢٤ ساڵ
ئارەزوو: شیعرو نامە گۆڕینەوە



ناو: مسلم شێخ أحمد برزنجی
ناونیشان: ئاگری ـ رۆڤیە
تەمەن: ١٧ ساڵ
ئارەزوو: نامە گۆڕینەوەو توپی پێ



ناو: علی محمود کاکە
نانیشان: کەلار ـ پیاز
تەمەن: ٢٠ ساڵ
ئارەزوو: وەرزش. خوێندنەوە



ناو: جرجیس محمد جرجیس
ناونیشان: رەواندوز ـ گەڕەکی ئازادی
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: وەرزش و نامەگۆڕینەوە



ناو: وهاب أحمد کریم
ناونیشـــان: کۆمـەڵگای تەکیە، ژمارەی
خانوو ١٧٠
تەمەن: ١٩ساڵ
ئارەزوو: شیعرو نامە گۆڕینەوە



ناو: محمد صالح ...
ناونیشان: دوز خورماتو ـ گەڕەکی
کوماری
تەمەن: ١٩ساڵە
ئارەزوو: توپی پێ



# سابـاتـەکـەی خـاڵـە رەجـەب



رەجەب

■ زۆر شیرینی.. !!؟

● خاڵـە گیـان، چوم بۆ ماڵـی خۆشـەویسـتـەکـەم چاییـەکی تاڵی دامێ، مانای چی یە؟.

احمد جلال، هەولێر

● خاڵـە رەجـەب پەنجـە گەورەی پێت چاوشارکێمان لەگەڵ دا دەکات..؟

یاسین خالد عبدالرحمن ـ صدامیە حلبجە

■ خۆتی لێ بشارەوە!!

● ئایـا خاڵـە رەجـەب کەی خێزانەکەی خۆش دەوێت؟

أیڤان سلطان ـ هەولێر

■ کاتی نان خواردن. !!؟

● ئەڵێن خاڵـە رەجـەب قەڵـەوبووە منیش ئەمەوێ قەڵەوبیم ؟چی بکەم باشە ؟

محسن عبداله سورچی ـ هەولێر

■ بچۆ بۆ ماڵی خاڵت. !!

● خاڵـە گیـان ،من خۆشـەویستیم زۆر کردووەو تاقیم کردۆتـەوە کچ بێ وەفان، تۆ ئەڵێی چی..؟

دلێر مزوری ـ قوشتپە

■ وەزعی گیرفانت باش نی یە

● بۆچـی کچـانـی ئەمـڕۆ حەز لە سوپەرو پارە ئەکەن؟

هەردی حسن علی ـ رانیە

■ دەست لەکاری خوا مەدە!!

● ئەگـەر ژنـەکـەی خاڵە رەجەب لە گەڵی هات بۆ بازاڕ ،خاڵە چی ئەکات...؟

ئاشتی حسین دەلۆ ـ کفری

■ گیرفانم دائەدورم.

● خاڵە رەجەب گیان:ـ
داوای شەدەلار دەکەم
پڕ بەدەم هاوار دەکەم
ئەگەر بێتو نەم دەنێ
لەرزگاری باردەکەم

جلال أنورشیروانی ـ هەولێر ـ رزگاری

■ کاکە جلال
داوای شەدەلار بکە
پڕ بەدەم هاوار بکە
پارەو سوپەرت نەبێ
هەر ئێستاکە بار بکە..!!

● خاڵە گیان من زۆر هەژارم ئەچمە لای هەر کەس ،هیـچـم نادەنێ ـ هانام بۆ تۆ هێنا خۆت و ویژدانت

یحی گۆڕان ـ سلێمانی

■ خوا بت داتێ!!

● خاڵە رەجەب
خەسوی من وەکو خەسوی تۆ هارە
تیمارم بکە دڵم زامدارە

کاروان حمە سعید ـ سلێمانی

■ کەچەڵ بتوانێ تیماری بکات تیماری زامی سەری خۆی ئەکات.

● خاڵـە رەجـەب من نازناوم نی یە، ئەمەوێ تۆ نازناوێکم بۆ دابنێی.

یاسین عوسمان چۆمانی ـ قوشتپە

■ یاعوچوا!!.

● خاڵـە گیـان مانـای چی یـە ئەگەر کەسێک جلی کوردی داکـەنـێ پانتۆڵی کاوبۆیو بریکی لە بەربکات؟

نەسرین قادر ـ حەریر

■ رێـوی لەکـونـی خۆی هەڵگەڕێتەوە گەرئەبێت.

● خاڵـە رەجـەب ،من دوو ژن و دوو خەسوم هەیە، تۆرات چی یە ؟

ن. أ. داماو ـ شەقلاوە

■ خوا فرسەتت بدات!!

● ئەگـەر خاڵـە ویستی سەر لە کۆمەڵگای پیرەمەگرون بدات و زستان بوو، لەبەر قوڕو چڵپاو چی ئەکات.؟

شوان محمد رسول ـ پیرەمەگرون.

■ بەشۆقڵ دێم !!

● حەز دەکەم تەمەنی خاڵە رەجەب بزانم؟

نجاة سلطان ـ هەولێر

■ لەپارەوە دوو ساڵانم!!

● من حەزم لە کچێک بوو، لەدوواییدا بۆم دەرکەوت حەزی لە براکەمە، چی بکەم باشە ؟

عثمان محمود احمد ـ سلێمانی

■ جارێ بزانە حەزی لەکێی تریشە!!

● خاڵـە رەجـەب ئەدرەسی خۆشەویستەکەتم بۆ بنێرە ممنون ئەبم؟

سامان خالد ـ مصیف صلاح الدین

■ نەی خۆی تاڵە!!





# ئاڵای ئۆلەمپی و خولەکانی

● (بارون بییری کوبرتان) یەکەم کەس بوو داوای دامەزراندنی خولی یاری یەکانی ئۆلەمپی نوێی کردو هەر ئەویش بوو نەخشەی ئاڵای ئۆلەمپی کێشا ، ئەوەبوو لیژنەی ئۆلەمپی جیهان رازی بوو لەسەر داواکەی (بارون)وساڵی ١٩٢٠بۆ یەکەم جار ئاڵای ئۆلەمپی بەرز کرایەوە لەشاری (أنفرس)ی بەلجیکا .

● پێنج بازنەکەش کە لە ئاڵای ئۆلەمپیدا نەخشە کێشراوە نیشانەی هەر پێنج کیشوەرکەی جیهانە ماناکەیشی ئەیە (کیشوەرەکان هەرچەند دوورن لەیەك بەڵام نیزیك ئەبنەوە لەیەك بەخۆشیو دڵپاکی وبرایەتی کە وەرزش نزیکیان ئەکاتەوە)

رەنگی شین نیشانەی کەرتەی (ئەوروپا)یە، سەویش نیشانەی (ئوستراليا)یە، زەردیش نیشانەی (ئاسیا)یە، رەشیش نیشانەی (ئەفریقیا)یە سوریش نیشانەی (ئەمەریکا)یە .

● ئەو شارانەی کە خولەکانی ئۆلەمپیاتی نوێی تێدا سازکرا ئەمانە بوون یەکەم (أثینا ١٨٩٦)، دووەم (پاریس ١٩٠٠)، سێیەم (سانت لویس ١٩٠٤) چوارەم (لەندەن ١٩٠٨) پێنجەم (ستوکهۆڵم ١٩١٢) شەشەم ( ١٩١٦) شەری جیهانی یەکەم بوو بەهۆی سازنەدانی حەوتەم (ئەنفوس ١٩٢٠)، هەشتەم (پاریس ١٩٢٤)، نۆیەم (ئیمستردام ١٩٢٨)دەیەم (لۆس ئەنجلۆس١٩٣٢) یانزەیەم (بەرلین ١٩٣٦)دوانزەیەم (مۆنتریال ١٩٤٠) سیانزەیە م (١٩٤٤ شەری جیهانی دووەم بوو بەهۆی سازنە- دانی )، چواردەیەم (لەندەن ١٩٤٨)پانزەیەم (هلسنکی ١٩٥٢ )، شانزیەم (ملبۆرن ١٩٥٦)، حەڤدەیەم (رۆما ١٩٦٠)هەژدەیەم (تۆکیۆ ١٩٦٤)نۆزدەیەم (مکسیکوستی ١٩٦٨)بیستەم (میونخ ١٩٧٢)بیست ویەکەم (مۆنتریال ١٩٧٦) بیست ودووەم (مۆسکۆ ١٩٨٠ ) بیست و سێیەم (لۆس ئەنجلوس ١٩٨٤)بیست وچوارە م (سیۆل ١٩٨٨)بریاریشە خولی بیست و پینجەم لەساڵی ١٩٩٢لەشاری (بەرشلونە)ی ئیسپانیا ساز بکرێت

ئامادەکردنی :
● عبدالستار جەباری ●

# چارچی یە

ئامادەکردنی ژیان

**عیلاجی دەردی دڵ (ئاری لە (طاهر بەگ)ئەمەنناکە:**
**بڵێ ئەمرو گوڵەندامێ بەتیرێ جەرگی پەی کردین**

## شیر ئاگریکە ناکوژێتەوە

من لەتەمەنی بیست ساڵی دام، لاویکم هەموکەس چاکەم دەڵی، ساڵی ١٩٨٦ بیرم لە ژن هێنان کردەوە. ماڵەوەشمان کچێکی جوانی خزمی خۆمیان بۆ داخوازی کردم. دوای ئەوەی کەسوکاری رازی بوون هێنام. دوای هێنان زۆرم ئەم ئافرەتە خۆش دەویست، چونکە بەراستی ژنێکی رەوشت جوان و کەیبانوی ماڵ بوو. بەلام ئەپەر خۆش گوزەرانیمان بوو بەئێش وئازار و خەفەت چونکە رۆژێک خەسووم کونە دراوسییەکی بینی بوو و هەواڵی کچەکەی کە بووەتە خێزانی من لێ پرسیبوو، ئەویش پێی گوتبوو کەشووی بە من کردووە. ژنە دراوسییەکە بە خۆیدا دەکێشێ و دەڵێ چۆن شتی وادەکەی؟ ئەی نازانی ئەوان شیری یەکیان خواردووەو خوشک و بران. لەو رۆژەوە ژنەکەم چووەتەوە ماڵی باوکی. دوای ئەوەی کە بەتەواوی مەسەلەکە بۆ خەسووم ساغ بۆوەتەوە. منیش لە دوورەخێکی ناخۆش دا دەژیم چونکە ناتوانم لەژنەکەم دوور بکەومەوەو ناشزانم بەرامبەر ئەم هەڵوێستە چی بکەم.

پارەمیو بدەن

ع . ق . م سلێمانی

### وەلام:

بەر لەهەمووشتێك ، برای بەرێز، دەبێ بە تەواوی لە مەسەلەکە دلنیا بیت، برو لای دراوسێ کۆنەکان و خزمەکانتان بەلکوئەوان چاکتر لە بیریان بێت، دوای ئەوەی تێ گەیشتی کە بەراستی پێکەوە شیرتان خواردووە، بپرسە: ئایا شیر پێ دانەکە چەند جار بووە؟ ئایا تا ماوەیەکی زۆر وبەردەوام و بەبێ پچڕپچڕی بووە یان نا ئەگەر بۆت ساغ بووەوە کە شیرخواردنەکە لە پێنج ژەم زیاتر بووەو هەر جارێکیش تا تێر بوون بووە ئەوە ژنەکە خوشکتەو لەتۆ حەرامە، بێ گومان دەبێ وازی لێ بهێنیت ، ئەوەی پێش ئەم رووداوەش فەوماوە ئێوە هیچ تاوانێکتان نی یەو خوا کەریمەو بەخشندەیە. چونکە ئێوە راستیتان لێ ون بووە.

بەلام ئامۆژگاریم تا تەواو دلنیا نەبیت هیچ کارێك نەکەیت.

## دووژن و ...سێ ژن و.. گێچەڵ

باوکم دوو ژنی هێناوەو کۆمەڵێك منداڵی هەیە، من کچی گەورەیانم، لە دوا ناوەندی دەخوێنم و لە خوێندنەکەشدا سەرکەوتووم، بەلام باوکم مەسرەفمان ناکێشێت و داخوازیمان جێبەجێ ناکات، هەرچەندە دەرامەتیشی زۆر باشە. ئەمەش چونکە دەیەوێ ژنی سێیەم بهێنێ هەرچەند قسەم لەگەڵ کردو هەوڵم دابەلام بێ سوود بوو، نازانم چی ناتەواوە؟ژن. منداڵ؟ ئەنجام هەر بێ دەنگی دەکردم و دەی گوت ئیشی تۆنی یە زۆر جار پێم گوتووە باشە ژن بێنە . بەلام داواکارییەکانی ئێمەش جێبەجێ بکە.

بەیانیان لە سەعات پێنجەوە دەردەچێ تا دوانزدەی شەو ناگەرێتەوە، بۆ ئەوەی کەسمان نەبینێ وداوای هیچی لێ نەکەین، ئەوەی راستی بێت ئەم گیروگرفتانە خەریکە کاردەکەنە سەر خوێندنەکەم وژیانی داهاتووشم نازانم واز لە ماڵ و گیروگرفتی ماڵ بێنم وشووبکەم ،چونکە داواکارم زۆرن، هەرچەندە وام لێ هاتووە رقیشم لە پیاوان بێتەوە. . ! یان ئارام بگرم و خوێندنەکەم تەواو بکەم.

ئاشنا ـ هەولێر

### وەلام

ئەگەر دەردو ئازاری تۆ بەم جۆرە بێت داخوا ئازاری دایکت و ژنەکەی تر چۆنە؟ ئەی ئەوان لەو ماڵەدا کاریان چی یە؟وا پێدەچێ لە باوکت دەترسن، لەبەرئەوە خۆیان لێ بێ دەنگ کردووە، بۆیە تۆ خۆت کردووەتە بەپرسیار، بەلام مەسرەف نەکردنی تا پارە بۆ ژن هێنانی سێیەم جار پاشەکەوت بکات. ئەوە دەرفەتە هەستی دڵ وسۆزی بەزەیی ببزوێنیت وپێی بڵێی چۆن پارە بۆژن هێنان پاشەکەوت دەکەیت کە ئێمە بێ خەرجی و چاو لەدەستی خەڵك بین؟ ئاخر ئێمە منداڵی تۆین هەقمان بەسەرتەوە هەیە بمان ژێنی . چۆن دڵت دێ ئێمە بەجل وبەرگی دراوو کۆنە جل دەربچین و بەرگی برسی بنووین؟

وابزانم، ئەم جۆرە شێوازە بۆی هەیە دڵی باوکت نەرم بکات و باوکایەتی و هەستی

دڵسۆزی ولاوانـدنـەوەی منداڵـەکانی لابـە هێزبکات . لـەلایەکی تریشەوە واچاکەلە گەڵ دایکت و باوەژنـەکـەت قسـەبکـەیت و بزانـە داخـوا بۆچی باوکت ئارەزووی ژن هێنـان دەکـات، ئایا ئەوان ڕێـزی ڕاناگرن و دەرحەق بەو درێغی دەکـەن؟ ئارادەیـەك ڕەنگی پیاوەکە وابزانێت پشت گوێ خراوە! ئەگـەر وابێـت بازیـاتر دڵی ڕابگرن و بایەخی زیـاتر پێ بـدەن . بـەچاکی دەزانـم قسـەلـەگـەڵ نزیکـەکـەکـانی باوکیشت بکـەیـت، بەڵـکـو ئەوان نەسیحـەتی دەکـەن و لەم بیـرە پەشیمانی دەکەنەوە.

ئەمـەوا ، بـەڵام تۆ هەر لەبـەر خاتـری ئەوە لە گێچـەڵی ماڵ ڕابـکـەیـت بتـەوێ شوو بەیـەکێـك بکەیت کەبیرت لێ نەکـردوەتـەوەو بە دڵت نی‌یـە ئەمـە ڕاست نی‌یـە . چونکـە خوشکێ! من لێت دەپـرسم، بۆچی ماڵێك هەیـە کەم وزۆر گێچـەڵ وگیـروگـرفتی تێدا نەبێت ؟ بەڵام گیروگرفت زۆر جۆری هەیـەو مرۆڤ دەبـێ بەپشوو و خۆگر بێت و هەوڵ بدات بەسـەریـان دا بێت و ژیـرانـە دوارۆژی گەش بۆخۆی دیاری بکات.

خەریکی خوێندنەکەت بە . . چونکە ئەنجامی خوێندنەکەت شەهـادەو ئیش کردنەو ئەو دەم زۆر کارتان بۆ ئاسان دەکات.

## ژن بەژنە..
## یان شیربایی

ژن بەژنە . . یان شیربایی
لاوێـکی تەمـەن ٢٣ سـاڵـیـم ، خوشـکێکم هەیـە تەمـەنی هەژدە ساڵـە . ویستم ژن بێنم کەسوکـارم خوازبێنی کچێکی خزممان، گوتیان باشـە بەڵام دەبێ ئێمـەش کچێکیان بدەینێ (بـەکـورتی بیکـەینـە ژن بەژنێ)، منـیش کەزانیم خوشکم بەمـە ڕازی نی‌یـە وازم لە مەسەلەکە هێنـا . پاش ماوەیـەك چووینـە داخـوازی‌ی کچێکی دی ئەوانیش ڕازی بوون بەڵام داوای پارەیـان کرد. ئنجا ئێستا من نازانم چ بکەم؟ خوشـکـی خۆم بەژن بدەم وخزمـەکـەمـان بێنم؟ یان خوشکم بەشـوو بدەم و بە پارەکـەی وی کچـەی دووەم بێـنـم؟ چونکـە بەڕاستی، دەمـەوێ ژن بێنم و ماڵ پێکە وەبنێم و ژن ومنداڵم هەبێت .

ڕێباز خۆشناو-شەقلاوە

### وەڵام:

تو لاوێکی تێگـەیشتـووی و دەزانی داب و دەستووی ڕزیو پـێـوەنـدی ژیـان ئاڵـۆز دەکـەن . . وە وەکـوو لەکەمان لەدەست زۆر داب و نەریـتی کۆنی بێسوود دەناڵێنێ . ئیدی دوودڵی بۆچی‌یە؟!

کاکـە ڕێـبـاز، کە هاتـووی پرسیـارەکـە ڕووبـەرووی گۆڤـاری ڕەنگین دەکـەیت، ئەمـە مانـای وایـە بە هەردوو کچەکەو بە مەرجەکانیان ڕازی نیت، بەڵام هەقی خۆشتـە هەوڵ بدەیت ژن بێنیت و ماڵ پێـکـەوە بنێـت . . بەڵام کە زانـیـت خوشـکـت بەم شووکـردنـە ڕازی نی‌یە وازت هێـنـاو بەزۆری زۆردارەکی ناچاری شووکردنت نەکرد . .

ئەمـەش هەڵـوێستێکی شایـان ڕێزوباس کردنە . . ئەی ئێستا چۆن هاتـووی جارێکی دی بیـر لەوە دەکـەیتـەوە بەزۆر بەشـووی بدەیت یان (شیربایی)وەرگرتن بیفرۆشیت؟ چۆن خۆت بەختیار دەکەیت و خوشکت ڕەنجەڕۆ دەکەیت؟

ئەی برای پیـاوو تێگـەیشتوو ! تۆ هێشتـا لەسـەرەتـای ژیـان دای و کچ زۆرەو دوورنـی‌یـە تووشـی کچـێـك بیـت کەسوکاری هیچ مەرجێك دانەنێن.

چاوەڕوان بەو کچـێـکـی تر هەڵبـژێـرە وپـەلـەمەکە نەوەك لەپـەلـە کردن دا زیـان و خەم وئـازار تووشـی نزیـکتـرین کەسی خۆت بکەیت.

## کورتە وەڵام

* کاکی ئازاربازی کەرکوك. أ. م
کورە ڕەحمەتی‌یـەکـەت مێ منـداڵی هەیـەو بەشـەرع و بە یاسـا هەقی ئەوەیـان هەیـە میـراتـی باوکی مردوویـان دەستگیر بێت، کەس ناتوانی یاری بە یاسا بکات.

* گوڵی شاخ ص. ر. ه
لەسلیمانی:
مادام زانیت ئامانج لە دوستی و لە پێوەندیی بەتۆوە چی‌یە، ئیتر بۆچی لەسـەری دەڕۆیت و پێـوەنـدی پێـوە دەکـەیت؟ گوڵـەخـان: وریای ئاوبانگی خۆت وکـە سوکـارت بەو ڕوو سووری خۆت بپارێزە.

* کاك سەرمەد لە دهۆك:
دایـك هەقـی لەسـەر کوڕوکـچی خۆیـەی هەیـەو خودای مەزن ئەرضـوویـەتی دڵی شکێن . دایـك ژیـنی خۆی بۆ ئێوەدانا . . نابێت ئێوە ئێـسـتـا ڕووی خۆی لێ وەربگێـڕن . هەتـا ئەگـەر پیـر بووە، وە لە هەموو شتێك هەڵ دەدات و قسە دەکات دەبێ دڵی ڕابگـرن، هەستی بریـنـدار نەکـەن. وەفـاداری بۆ دایـك زۆر پێویستە.



# ڕێبین
# ڕێی خۆی دەدۆزێتەوە

**● بڕەرەکەی ڕێبین و داهێنانێکی ڕەنگین**

**● دەست و پەنجەی بچوك شتی گەورە دروست دەکات**

● لقی سلێمانی ●

وێنەگرتنی:
نضال حمه صالح





ئەگەر یەکی نەیناسێت وا دەزانێت کچێکی ئاسایی یە بەڵام کاتێ نزیك بیتەوەو بیناسیت ئەوسا دەزانیت ئەم کچە(ڕێبین مصطفی عثمان)هەر لە ئێستاوە چ بلیمە تێکەو چ توانایەکی هەیە دیارە ئەمەش ئەنجامی خستنە کاری بیرو هۆشی خۆیو دەست گرۆیی دایك و باوکیەتی کە هەمیشە هانیان داوە کە سەرکەوتوو بێت لە قوتابخانە داو لەم کارەش داو لەم کارەش دا(بەرگدروویی )کە توانایەکی بێوێنەی هەیە چ لە برین داو چ لە دوورین دا بینەر سەرسام دەکات، بۆیە ئێمەش ڕوومان لە ئاموزگاکەی کرد (ئاموزگای بەرگدرووی ڕاستی ئەم گفتوگۆیەمان بەدەم برین و دوورینی کراسێکەوە بۆ کچێکی بچکۆلە کەلەوێ بوو لەگەڵ ڕێبین خان کرد

**● تەمەنت چەندەو ئێستا پۆلی چەندیت:**

ـ لەچواری سەرەتایی بووم دەرچووم بۆ پۆلی پێنج و لەساڵی ١٩٨٠دا لەدایکبووم لە سلێمانی.

**●کەی فێری بەرگدروویی بوویت:**

ـ هەر لە منداڵیەوە حەزم لێی بوو لەگەڵ دایکم دەهاتم بۆ ئەم ئاموزگایەو ئەویش ڕێی لێ نەدەگرتم ئەچوومە سەر مەکینەکان و بەکارم دەهێنا، تاوەکو







بەتەواوەتی ماوەی چوار ساڵە فێر بووم

● چی دەدووریت.

- هەموو شتێکی منداڵانە و ژنانە دەدوورم کراس و تەنـوورەو تەنوورەی کلۆش و پانتۆڵ .. هتد

●هەر خۆت دەیبڕیت:

- بەڵێ

● کامـیـان ئاسـان ترە جلی منداڵ یاخود گەورە:

- وەك یەکن چونکە هەردووکیان دەزانم.

● ئەی لە قوتابخانە چۆنیت:

- تائێستا نەمـاومـەتـەوەو هەمـوو ساڵێکیش بە یەکەم دەرچووم.

●حەز لە چیتر دەکەیت:

- وێنـە کێشـان، پار لە پێشـانگـای قوتابخانەکەمان دا بەشداریم کرد بەچەنـد تابلۆیـەك هەروەها جل و بەرگ دەسـتکـردی خۆمم بردبـوو پیشانم دابوو.

● چی دەخوێنیتەوە:

- ڕەنگین و ڕۆژنامە کوردیەکان.

● دەڵـێـن خوشـکـە بچـکـولـەکـەشـت بەرگدروویەکی چاکە؟!

-(ڕۆژان)ی خوشکم لەمن بچوکترە ئەویش زۆر باشە.

● ئەی بۆ نەهاتووە!

- وتـمـان گۆڤـاری ڕەنـگـین دێن شەرمی کرد ئیمرۆ نەهات.

●لە بەڵێن دا چۆنیت:

- ئامۆژگاکەمان چۆن ناوی ڕاستی‌یە منیش هەروا ڕاستگۆم

●ئەگەر یەکێ جلەکەی بەدڵ نەبوو:

- قوماشی بۆ دەکڕمەوەو جارێکی تر بۆی دەدوورمەوە.

●ڕێبین خان حەز دەکـەیت ببیت بەچی!

- بە ئەنـدازیـارێکی نەخشەکێش بۆ ئەوەی یارمەتی دایکم و باوکم بدەم.



هەسـتـیـار کاك مەلا ئەحـمـەدی ئاسنگـەر بۆی نوسـیـوین ئەڵێت«لـەشـارە تازەکـەی گەلاڵـەی سەربـە قەزای صدیـق چاوم کەوت بەکـۆمـەڵە پیریکەوە ڕەنگینیان بە دەسـتـەوە بوو منـیش ئەم وێنـەیـەم گرتن و پێشکـەشی ئێوەم کرد»

سوپـاس بۆ کاك ئەحـمـەدو داوای تەمـەن درێژی و بەرهەم ـ پوختی بۆ ئەکەین

● ڕەنگین ●

# وەرگێران
# ل زانکویا مویسل



ملموستا خالد محمود اسماعیل بو پەیامنیری ڕەنگین دئاحفت



ئاڤان عثمان سعید

مە قەستا پشکا وەگێرانێ ل کولیچا ئادابێ - زانکویا مویسل کر دا ژ نێزیك سەحکەینە ئالوزی و گرفتاریێت دکەڤنە دڕێکا شاگردێت وێدا . . ل پێشیێ مە چاڤپێکەفتنەکا کورت ل گەل د. یوئێل یوسف عزیز - سەروکێ پشکا وەرگێرانێ کر:

**● چەوا پشکا وەرگێرانێ ل مویسل دبینی هەڤبەری پشکا وەرگێرانێ ل زانکویا (مستنصریە) . . ؟**

- پشکا وەرگێرانێ ل مویسل وەکو (مستنصریە هەردو پشك ئێك کتێب دخوینن و ئارمانجا وان هەردوکا ژی گرویێت گەلەك پاش و خوین گەرم بو وەرگێرانێ و شیان هەبیت لسەر وەرگێرانێ بو هەردو ئەزمانا دەربێخین . . . نیشانا پشکا وەرگێرانێ ل مویسل ئەوە کو کەڤترە ژێ (مستنصریە)، لێ مە دەسپێکر وەك چق (فرع)نەر ئەزمانێت ئورویی . . سالا ئێکێ و دوێ خاندن گشتی بوە، بەلێ ل سالا سێیێ و چارێ تایبەت بیت بو وەرگێرانێ، بەری دو سالا ببو پشك (قسم)، ڤێجا ئەگەر ئەم بێژین پشکا وەرگێرانێ ئەم دێ زانین کو نویترە ژ (مستنصریە).

**● ئالوزی و گرفتاریێت پشکا وەرگێرانێ برەنگەکێ گشتی چنە؟**

- ئەم نابێژین ئالوزی و گرفتاری نین، بەلێ نە ئەو ئالوزیێن دژوارن . . ئالوزی دەسپێدکەن دەمێ شاگردتێتە وەگرتن زانکویێ ، بەلێ پشتی سالا دوێ هەمی گرفتاریێت شاگرداونەدادبن و ژیان بەرەف خوشیێ دچت ل پشکا وەرگێرانێ . .

**● یا ئەم دزانین کو تو د. (علم اللغە)ی ڤێجا بوچی نەوەی (جیل ئینگلیزیێ هەڤچەرخ ئەزمانێ شکسبیر تێناگەهن و بوچی ئەم ئەوی ئەزمانێ کەڤن دخوینین . . ئەرێ ئەم نەپێتڤی ئەزمانەکێ نوینە دا مە شیانەکا خورت هەبیت بو وەرگێرانێ؟**

- ئەزمانێ ئینگلیزی نا رازیت ب کەڤناتیێ لەوما بەرەف وەراریێ و پێشکەفتنێ دچت درێزمان و پەیڤێت خودا ڤێجا ئەڤەیە ئەگەرا نەتێگەهشتنا نەوەی ئینگلیزی ئەمانی شکسپیر هەرچەندە نە وەك ئەزمانێ عەرەبییە ، چنکی ب عەرەبی ب ئەزمانەکی رنڤیسن و بەزمانەکی دئاخڤن

**● بوچی وەرگێری ئەو شیان وهێزا خورت نینە ژ ئەزمانێ خو وەگێرت ئەزمانێت دی . . ؟**

دپشکا وەرگێرانیدا پێتڤییە وەرگێران بو هەردو ئەزمانا بیت ، بەلێ دژیانا هەروژدا وەرگێران لسەر ئەزمانێ مروڤی دراوستت . . بەلێ وەرگێران بو ئەزمانێت دی لاوازی

**● د. یوئێل براستی ئەم گەلەك سوپاسیا تە دکەین و مە تو گەلەك مژویل کری . .**

- ئەز سوپاسیا وە دکەم وهیڤیدارم روژنامەگەریا کوردی هەرا پێشکەفییت دگەل ڕێز و سلاڤێت من بو ڕەنگین . . پشتی ئەڤێ چاڤپێکەفتنا کورت مە قەستا ژورا ماموستا

**(خالد محمود اسماعیل)**

کردا ئەو ژی بو گوڤارا مە بپەیڤت: [ بزاڤا وەرگێرانێ دڤان روژدا ژ بزاڤا وەرگێرانێ ل (دارالحکمە)ب هێزترە . . چنکی جیهانامە یا پێش دکەڤیت و رولێ وەرگێرانێ لدیڤ پێنگاڤێت وەراریێ دچت ل دەولەتێت پێشکەفتیدا . . رولێ وەرگێرانێ لنك مە دراوستت لسەر پشکێت وەرگێرانێ ل زانکویێت مە ژ زمانێت بیانی وەك (ئینگلیزی و روسی و ئەلمانی و ئسپانی . . هتد)

پشتی هینگی شاگردێت کورد ل پشکا وەرگێرانێ بومە ئاخفتن

**عبدالکریم یوسف صالح :**

شاگردێ وەرگێرانێ دڤێت زانینەك



عبدالکریم یوسف



صالح یوسف حسین



مرشده محمد

ب رەوشـەنبیریا بیانی هەبت ژبلی رەوشـەنبیریـا کوردی وعـەرەبی، ئانکـو دڤێـا یێ شەهرەزابت د زمانێ ژێ وەرگـێـرت ئو یێ بو وەرگێـرت . . . ئەز دبینم وەرگێـرانُ زانین و هونەرو شیانە.

## شرین حسن محمد :

ژ گرفـتـاریێت مەزن بو شاگـردی دەمێ دەقـەکی وەردگێـرت نەزانینـا وی بو هنـدەك ئیدیـەمـا (مصطلح) . هـەر وەسـا هەژاری‌یا شاگـردی‌و دەسـت کورت یاوی ژ ئالی دراڤی‌ڤـە نەشێت فەرهـەنگـا بکـریت نەخـاسـم فەرهـەنـگ ڤان هەیـامـا گەلـەك گرانن ژ ئالی بهایێ ڤە، ئو ئەڤـە ژی ئێکـە ژ ئالـوزیێت مەزن ل جەم شاگردا . مخابن دەمێ ئەم هەوجـەدبین سەیـدایێت خوە بو وەرگێـرانێ ئو ئەم قەسـتـا وان دکەین دبینین هەر بشـولن . . ژ ئالـوزیێت دیـار ئەوە ئەگەر شاگرد کورد بیت و خوانـدنـا خوە هەمـی ب کوردی خواندبت وشەهرەزایا وی دئەزمانێ عەرەبیـدا کێم بت نەخـاسـمـە د رێزمانێدا

## زهیر عبو مزوری :

ئەز دەبێـژم چ ئالـوزی و گرفتـاری نابن ئەگـەر مروڤ لدیف هیڤیا دلێ خوە هاتیتـە پشکـا وەرگێرانێ . . . رولێ وەرگێـرانێ گرنکـە دژیـانـا مروڤێ هەڤچەرخ دا چنکی چەندی مروڤ ئەزمـانـەکێ بیانی بزانت دێ شێت خزمـەتـەکـا خویـا پێش کێش کەت بو مللەتێ خوە ومـروڤایەنیێ و ئەوژی دێ ئێـت ژ گەلـەك رێـکـا . . سەرکەفتن بو وەرگێرانا گەش

## ئاڤان عثمان سعید :

بەلێ ،بـەشی وەرگێـران بەشێکی تایـەتـەو سەربـەخـویـە ئەمەش بە هوی ئەو لایـەنـە زورانـەی کە لەم بەشـەدا هەن، جا ئەگەر ئەم لایەنانە چ لە کومپانیاکاندا بن وەیان لە دام و دەزگـاکـانی دەولـەتـدا، وە ئەوەی راستی بێت وەرگێـران کارێکی سانا نی‌یـە پێـویـسـتـە لەسـەر وەرگێـر شارەزایی‌یـەکی تەواوی لەسـەر هەردو زمانەکەدا هەبێت بو ئەوەی لە کارەکەی‌دا سەرکەوتوو بێت.

## صالح یوسف حسین :

ئەز دبێـژم چ ئالـوزی د پشـکـا وەرگێـرانێـدا نینن و ئەز دبینم وەرگێـران پشکـەکـا پاشـە ومن هەتـبـژارت و دراوسـتـت لـسـەر «وەرگێـرانا بلەز الترجمه الفوریه»ئو چاڤپێکەفتنا ل ناڤ بەینا وەفدێت بیانی . .

هەر وەسـا وەرگێـران تشتـەك گەلەك گرنکـە بو دەولـەتێ . . وەگێـران چڤـەکێ پر بهـایـە چنکی گەلـەك نەتەوایا پێکڤە گەیدەت . . .

## مرشده محمد :

وەگێـران دڤی چەرخیدا . . چەرخێ وەراری‌و پێشکـەفتنێ . . تشـتـەکێ گەلەك پێتڤی‌یە بو مللەتان . . چنکی ب وەرگێرانی هەمی (پرێت)جیهانێ دگـەهنـە ئێـك . . بڤێ رێکی دێ شێین تورێ جیهانی خوینین وکەفتە بەر دەست رولی وەرگێـرانێ دژیـانا مروڤێ هەڤچـەرخ دا گەلـەکی خویـایـە چنکی ئەزمـانـەکێ بیـانی دزانت ونـاسینـەکێ لـسـەر هزرو بیرو تورێ وان دێ کەت ،ڤێـجـا سـەرفـەرازی بو وەرگێـرانـا خزمـەتا مروڤـایـەتـیـێ بکـەن



شیرین حسن محمد

هوسـاسـەرەدانامە بو کولیچا ئادابێ ـ زانکویا مویسل بدویما هیك هات.

● بدل رڤو ●

پەیامنێرێ رەنگین ژ موصل



● وەرگێڕانی فوزي عبدالمجيد ●





ئەکتەری سۆڤێتی الینابستلاکوف رۆڵی سەرەکی لەفلیمێکی تازەدا وەرگرتووە کەبەناوی پیاوانەوەیە بریتی‌یە لە چیرۆکێکی پۆلیسی کە ڕۆمان نووس ایکور ایجییف نووسیویەو

سیرچی پولشنکوف دەری هێناوە ئەم ئەکتەرە خوێندنی سینمایی لە مەعهەدی‌سینەمای نیشتمانی لەمۆسکو تەواو کردووەو بەپلەیەکی باش لە بەشی دەرهێنانی سینمایی دەرچووە

● TilM ●



...کچی ...ـیشی تورکی (پەمبە) کە ...ـی لاویتی‌و جوانی لەرووومەتیا ...دنی دەکریت زوربەی ...ـکەرانی ...ـفزیونی تورکیاو هەندی ...ـچـی ...ـەلاتی ناوەراست خوشیان ...ی. ...ـت بەپیشکەش کردنی نمایشەکانی دەکات.

ئەم کچە لەم رووەوە زۆر بەناوبانگ بووە.

بەتایبەتی لەتورکیا. سالی ١٩٨٨ زیاتر لە ٧٥٠ هەزار دولاری دەسکەوت بووەکە.

کە بوتلفزیونی تورکیا وێنەو نمایشی ئامادە کردووە.

● week ender ●





# شاژنەکان داب و نەریت دەشکێنن

داب و نەریتی پاشاکانی ئەوروپا وایە کە شاژن و خانمەکان لەگەڵ منداڵەکانیان دا وێنەی خۆیان ئەگرن. بەڵام خاتو [کارولین] خاتوی موناکو ئەم داب و نەریتە باوەی شکاندو منداڵەکانی (شارلوت)و (پییر) هەمیشە ئەگەڵ خۆیدا بۆ ئاهەنگە گشتی‌یەکان دەیان بات و پێکەوەش وێنە دەگرن. هەروەها خاتوی ویلز (دیانا) خێزانی وەلی عەهدی بەریتانیا ئەگەڵ (ویلیم)و (هاری)دا وێنەی گرتووە.

● ئەمریکی‌یەزە ●
لە کۆتری ـ ـیمی.

## شەپقەو جل وبەرگ







لەم دوایی یانەدا لە سوڤیەتدا گەلێ خانەی جل وبەرك بەتایبەتی لە پایتەخت «موسکۆ»دا دامەزراوە.. کە جل وبەرگی باولە هەورێشم وتووکی باڵندە دروست دەکەن. بۆئەوەی ئافرەتی سوڤیەتی دەست بەخۆیا بێنێ‌و دیمەنی‌خۆی لەبیرنەکات. ئەوەی شایانی باسە ئەم جل وبەرگ و شەپقانە نرخێکی هەرزانیان لەسەر داناوە تا ئافرەتی سوڤیەتی بتوانن بیکرن. جارانیش لەم وڵاتەدا گوێ بەم لایەنە نەدەدرا.

لەگۆڤاری
● سپوتنیك ●

## وەڵامی مەتەڵەکەش

سەرسەنگ ـ هاوینەهەوارێکە لە پارێزگای دهۆك
سەرچنار ـ هاوینە هەوارێکە لە پارێزگای سلێمانی
سەری ڕەش ـ هاوینەهەوارێکە لەپارێزگای هەولێر

## سەرەنجامی گرەوی ژمارە |٣٣|

یەکەم :ـ پەخشان محمد أحمد
مامۆستای قوتابخانەی (شێخ عباس)لە سلێمانی
دووەم زیاد یوسف هەرکی کۆمەڵگای بەستورە لە هەولێر
سێیەم :ـ لقمان خدر محمود گوندی قەرەتی ئاغا لەرانیە

مەتەڵ حەوت پیتە تەواو بیزانە
ناوی دەشتێکە لەم کوردستانە
پیتی سێ وچوار لێل پیتی یەکدا
بۆ دڵ تەنگی‌یە لەهەموو کاتدا
پیتی یەك و چوار لەگەڵ سێ‌یەمدا
کارێکی بەدە لەناو کۆمەڵدا
پیتی شەش و چوار سێ‌و چواری لێبێ
خێرامەوەستە ئاگات لە خۆبێ
ئەوی هەڵبێنێ مەتەڵ ئەمجارە
ناوی لەرەنگین تۆمار کراوە
هەولێر ـ ئامادەیی زرگاری ـ فاخر حامد گەروتەی







## ئاسۆیی

١- ترس - سالی رابردو.

٢- درکێکی چەمیلەیەبە - رەکەشی نەخوری - پەیمان «هـ».

٣- شارێکی کوردستانی عیراقە - قیژە «هـ»

٤- یەکەم روژنامەی کوردی - نیوەی (کەچ) - دوو پیت لە(دەوەن).

٥- کولیکی بەهارەی دیمینە دەرمانیشی لی دەردەهینری - کەمان «ت».

٦- خواردنی ئاژەلە - ئەندامیکی خیزانە

٧- ـــــ

٨- پایتەختی کوماری بولکاریا«هـ» - خواردنی ئاژەلە.

٩- خون «هـ»- ئەندامیکی لەشە«هـ».

١٠- رەنکیکە «هـ»- جوان «ت».

١١- لەسەرخو- شنەی بەیانی

١٢- جەژنی کوردە.

١٣- یەکەم کەس کە بارودی دوزیەوە «هـ».

## ستونی

١- وولاتیکی ئەفەریقی‌یە

٢- بی‌دەنگ «هـ» «بینی «هـ».

٣- رتل «ت»

٤- وولاتیکی ئەوروپی‌یە - بالندەیەکی گوشت خورە«هـ».

٥- هرماسل «ت» - کولیکی بەهارەی بون خوشی میرکیە«هـ».

٦- ساتی - بالندە.

٧- کومەلەمەر«هـ» - دەرمانیکە چاوی پی رەش ئەکری - پایتەختی ئەلمانیای روژئاوا «هـ».



٨- دوزەرەوەی رادیو «هـ» - سور«ت».

٩ - کچەنەکتەریکی میسر«هـ».

١٠- چیایەکی کوردستانە لەناوچەی سورداش - خیرا «هـ».

١١- چالاك «ت»- نیوەی (وەرە)

١٢- کوچ - بانو «ت»

١٣- بروا.

١٤- شیلەی کون.

ئامادەکرنی

● بریارعوزیری ●






# لە ناو
# گوڵ و گوڵزارا


دەشتیٚ صالح دەلوٚ


روژان مصطفی عثمان


هیثم جلیل ابراهیم


شنوٚ طاهر سعید


هانا قادر برسی


ئەڤین عزیز آمین


شواریٚ سالار


شڤان شوکت طاهر سندی


نوشیران طاهر سعید


جوانیٚ عدنان محمد


گوٚنە رؤوف عزیز


راویژ رەسووڵ


هوزان عثمان


دلٚپاك لطیف محمود



ئارام محمد علی قەرەداغی



لینا ئازاد توفیق



ئەژین یاسین علی



هەلالە هیوا محمد



شەیدا خالد عبدل



هاژە عبدالله فرج



ژینۆ جلال رضا



محمد خسرەو کاوانی



ئارەزوو محی الدین حسین



نەهرو حویز محمد



سەرکەوت سالار حەمەرشید



کوژیر حمید مجید الداودی



گونا عثمان رمضان



دیرین کمال فرج



هیمن غفور کریم سعید



شنو، ئاڤان عاصی فاتح وەیس


نەهلە جزراوی
کاریکاتێر


ئافرەت هەزار جار پێم وتوی هێلکە ناکڕم توشی نەخۆشی زولالمان ئەکات
نەیخۆی تاڵە


ئەچمە بازاڕ تا بزانم نرخم چەندە؟
بارت سەنگینە، بازارت گەرمە


گیانە لەم ڕۆژانە مریشک دز زۆربون
وتمان مریشک بە خێو بکە، ئەمان وت بهێنەوە ژوری نوستنەوە
خۆ... خۆ
!!!
!

